


# تیمساح

دۆستۆیڤسکی

وەرگێڕانی:

کاروان مەحمود

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: **سیروان مەحمود**
بەڕێوەبەری هونەری: **باسم ڕەسام**




ناوی کتێب: تیمساح
ناوی نووسەر: دۆستۆیڤسکی
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: کاروان مەحمود
بابەت: چیرۆک
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٥
چاپخانە: پەنجەرە
تیراژ: (٣٠٠٠) دانە
نرخ: (٤٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٣٣٩)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێ دراوە.



ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە/ **ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

## ڕووداوێکی نائاسایی

باس لە چیرۆکی پیاوێکی بەتەمەنی بەڕێز و بەهەیبەت دەکات، کە چۆن لەلایەن تیمساحێکەوە بەزیندوویی قووت دەدرێت لە گەلەرییەکدا، هەروەها سەرجەم ئەو ڕووداوانەی تر، کە بەشوێن خۆیدا دەیهێنێت.

لامبێرت! لامبێرت لەکوێیە؟

ئایا لامبێرتت نەبینیوە؟

(١)

لە بەرواری سیازدەی مانگی یەکی ئەم ساڵدا کە ساڵی١٨٦٥ە، لە کاتژمێر دوازدە و نیوی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا، ئیلینا ئیڤانۆڤنا (خێزانی ئیڤان ماتڤیتیچی هاوڕێی ڕۆشنبیرم، کە هاوکارمە لە هەمان ئەو بەڕێوەبەرایەتییەی کاری لێ دەکەین، یان ئەتوانرێت بوترێت بە هەمان شێوە جۆرێک لە پەیوەندیی خزمایەتیش لە نێوانماندا هەیە)، مەیلێکی سەیری تێ گەڕابوو، کە هەر ئێستا بۆ بینینی ئەو تیمساحە بچن، کە لە گەلەرییەک بۆ نمایشکردن دانرابوو.

ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە ئیڤان ماتڤیتیچ پێشتر بلیتی چوونەدەرەوەی لە گیرفاندا بوو، بەنیازی گەشتکردن بوو (هەڵبەت گەشتەکەی ئەو بۆ چارەسەری تەندروستی نەبوو، بەڵکوو گەشتێکی ڕۆشنبیری بوو بۆ زیاتر پەرەپێدانی مێشکی). هەروەها خۆدوورخستنەوە لە جەنجاڵی ئەو کاری کارگێڕییەی کە تووشی ماندووبوونی

کردبوو. هەرچۆنێک بێت، ئەو بەیانییە هیچ کارێکی وای نەبوو بیکات، بۆیە هیچ بەرهەڵستییەکی بەرامبەر ئەو مەیلە حولحولیانەیەی خێزانەکەی نیشان نەدا، بگرە خۆشی حەزی بینینی تیمساحەکەی تێ گەڕابوو، بۆیە بە دەنگێک، کە ڕەزامەندییەکی زۆری پێوە دیار بوو، وتی:

"چ بیرۆکەیەکی نایابە! بۆ بینینی تیمساحەکە ئەڕۆین! ئەمەش ڕێک پێش ئەو ئێوارەیەی کە بەتەمام گەشتەکەم بکەم بۆ ئەوروپا. بیرۆکەیەکی خراپ نییە پێش ئەوەی بڕۆم شارەزایی لەگەڵ ئەو هاوولاتییانە پەیدا بکەم، کە لە وڵاتەکەمان نیشتەجێن."

لەگەڵ دەربڕینی ئەم وشانەدا، قۆڵی کرد بە قۆڵی خێزانەکەیدا، دەستبەجێ بەرەو گەلەرییەکە بەڕێ کەوتن. منیش وەک هاوڕێیەکی گیانیبەگیانی خێزانەکە، ئاسایی وەک هەموو جارەکانی تر، چوومە پاڵیان. هەرگیز پێشتر ئیڤان ماتڤیتچم بەو شێوەیە بەئاسوودەیی و مێشکسافی نەبینیبوو، وەک لەو بەیانییەی کە هەرگیز لەیاد ناکرێت بینیم - ئەبێت تا چەندێک ڕاست بێت، کە ئێمە نازانین چ چارەنووسێک چاوەڕێمانە!

هەر کە پێمان خستە ناو گەلەرییەکەوە، ئیڤان ماتڤیتچ یەکسەر تووشی سەرسووڕمان و شادییەکی بێئەندازە هات بە هۆی شکۆمەندیی تەلارەکەوە، کاتێکیش

کە گەشتین بەو دوکانەی جانەوەرەکەی لێ بوو، ئەو تیمساحەی ماوەیەک بەر لە ئێستا بۆ پترسبۆرگ هێنرابوو، نمایش دەکرا.

ئیڤان ماتڤیتچ، خۆبەخشانە بیستوپێنج کوپیکی بەخشییە خاوەنی تیمساحەکە، بۆ ئەوەی ڕووخسەتی منیش بدات تیمساحەکە ببینم، شتێک کە هەرگیز پێشتر ڕووی نەدابوو. بەرەو ژووروچکەیەک بەڕێ کەوتین. تێبینیی ئەوەمان کرد، کە لەپاڵ تیماساحەکەدا، هەندێک تووتیش بەرچاو دەکەوتن، کە لە جۆرە تووتییەک بوو؛ ناسرابوو بە (کاکەتوو)، هەروەها کۆمەڵە مەیموونێکیش بەرچاو دەکەوت، کە لە قەفەسێکی تایبەتیدا خەویان لێ کەوتبوو.

نزیک دەرگای هاتنە ژوورەوە، بەدرێژاییی لای چەپی دیوارەکە حەوزێکی گەورەی کانزایی دانرابوو، لە بانیۆ دەچوو، چواردەورەکەی بە جۆرە ئاسنێکی تەنک پەرژین کرابوو. بەقووڵاییی دوو ئینج پڕ کرابوو لە ئاو. لەناو ئەم حەوزەدا، کە هێندە قووڵ نەبوو، تیمساحێکی گەورەی تێدا هەڵگیرابوو، کە وەک کۆتەرە دارێک تەواو بێجووڵە ڕاکشابوو. وا دەر دەکەوت ئاووهەوا شێدارەکەی شارەکەی ئێمە ئەو تیمساحە داماوەی بەتەواوی لە جووڵە خستبێت، هەروەها پێنەدەچوو زۆر حەزی بە چارەی ئەو سەردانکەرانە بێت، کە هاتبوون بۆ تەماشاکردنی.

ئەو دەعبایە، لە سەرەتادا بە هیچ شێوەیەک ڕووی پێ نەدان، بە شێوەیەک، کە ئیلینا ئیڤانۆڤنا بە دەنگێک، کە تژی بوو لە پەشیمانی، وتی:

”کەواتە ئەمە بوو ئەو تیمساحەی باسیان دەکرد! نازانم بۆ وا بیرم دەکردەوە کە... دەبێت شتێکی جیاوازتر بێت.“

لەوە دەچوو ئیلینا ئیڤانۆڤنا وا بیری کردبێتەوە، کە ئەو تیمساحە لە ئەڵماس دروست کراوە. خاوەنی تیمساحەکە، کە کەسێکی ئەڵمانی بوو، هاتە دەرەوە و بە چاوێکی پڕ لە فیز و شانازی و هەستێکی نائاسایی پڕ لە خۆبەزلزانییەوە لێی ڕوانین.

ئیڤان ماتڤیتیچ چرپاندی بە گوێما، ”مافی خۆیەتی ئا بەو شێوەیە شانازی بە خۆیەوە بکات. چونکە دەزانێت کە خۆی تەنها پیاوە لە ڕووسیادا تیمساح بۆ خەڵک نمایش دەکات“

من ئەم سەرنجە نالۆژیکییەی ئیڤان ماتڤیتیچی هاوڕێم وا وەرگرت، کە بە هۆی ئەو خۆشییە زۆرەوەیە، کە سەرتاپای بیر و هەستی گرتبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە زۆربەی ’بۆنەکان‘ دا جۆرە هەستێکی ئیرەییبردن تێدا دروست دەبوو، بۆیە ئەو قسانەی کە کردی، بۆ من زۆر جێگەی سەرنج نەبوو.

ئیلینا ئیڤانۆڤنا، کە لە بێدەنگی و کەللەڕەقیی خاوەنی تیمساحەکە ئاسوودەییی خۆی لەدەست دابوو، زەردەخەنەیەکی ئەفسوناوی خستە سەر لێوەکانی، بۆ ئەوەی ئەو ڕووە گرژ و تاڵەی کابرای خاوەن تیمساح ئاسایی بکاتەوە. ئەمەش کارێکە، کە ئافرەتان ئەیکەن - وتی:

"لەو باوەڕەدا نیم تیمساحەکەی ئێوە زیندوو بێت."

خاوەنی تیمساحەکە بە ڕووسیەکی شەقوشڕ وەڵامی دایەوە:

"ئۆی، نا، خانمەکەم!"

خاوەنی تیمساحەکە بێ وەستان و بەخێرایی پەرژینە ئاسنینەکەی جووڵاند و بە چیلکەیەک ئاژنییە سەری دەعباکە. ئیتر دەعبا بەڕواڵەتباشەکەش، بۆ ئەوەی نیشانمان بدات زیندووە، دەستەکانی لەگەڵ کلکیدا جووڵاند. لمۆزی بەرز کردەوە و دەستی بە جۆرێک لە مشەمشکردن کرد.

کابرای ئەڵمانی، وەک ئەوەی نەوازشی تیمساحەکە بکات، چێژیشی لە خۆبەزلزانییەکەی خۆی بینیبوو، وتی:

"زۆر باشە، کارلشن، وەرە، دڵگران مەبە نازدارەکەم."

ئیلینا ئیڤانۆڤنا زیقاندی و بە مەکربازییەوە وتی:

چ تیمساحێکی قێزەونە، بەڕاستی ترسام. ئەزانم ئەمشەو خەونی پێوە دەبینم!"

کابرای ئەڵمانی بەخێرایی وەڵامی دایەوە:

"بەڵام ئەو ناگرێت گاز لێتان، ئەگەر ببینن خەو پێوەی."

کابرای ئەڵمانی، وەک پاڵەوانێک سەری وەرچەرخاند و تەنها کەسێک بوو بە قسەکەی خۆی پێکەنی. نەیتوانی هیچکام لەم سێ کەسەمان بە قسە بێتامەکەی بخاتە پێکەنین. بۆیە کەسمان وەڵاممان نەدایەوە.

ئیلینا ئیڤانۆڤنا بە لووتبەرزییەوە ئاماژەی بۆ کردم، وتی:

وەرە سیمیۆن سیمۆنیچ، با بڕۆین تەماشای مەیموونەکان بکەین. من شەیدای مەیموونەکانم؛ ئەوان زۆر ڕۆحسووک و لەبەردڵانن... بەڵام ئەم تیمساحە زۆر قێزەونە.

ئیڤان ماتڤیتیچ بۆ ئەوەی ئازایەتی و جوامێریی پیاوانەی خۆی بە خێزانەکەی نیشان بدات، بانگی لێ کردین و وتی:

"ئاهو، گیانەکەم، مەترسە! ئەم تیمساحە خەواڵووە حەپۆلەی سەرزەمینی فیرعەونەکان، هیچ ئازارێکمان پێ ناگەیەنێت."

ئەو لای حەوزەکە مایەوە و لەگەڵ ئێمە نەهات. دەستکێشەکانی لە دەستی داکەندبوو و بە دەستکێشەکانی کەوتبووە ختووکەدانی لمۆزی تیمساحەکە، پێی خۆش بووە، هەر وەک لە دواییدا خۆی دانی پێدا نا، کە ویستوویەتی تیمساحەکە بخاتە مرخەمرخ.

خاوەنی تیمساحەکە بە هاوەڵی ئیلینا ئیڤانۆڤنا بۆ نزیکی قەفەسی مەیموونەکان ڕۆیشتن لەگەڵیدا، ڕێز و نەزاکەتی خۆی لە بەرامبەر خاتوونێکدا نیشان دا.

بەم شێوەیە هەموو شتێک بەباشی ئەڕۆیشتە پێش، بۆیە پێشبینی ڕوودانی هیچ کارەساتێک لە گۆڕێدا نەبوو. ئیلینا ئیڤانۆڤنا بە کاتبەسەربردن لەگەڵ مەیموونەکاندا تەواو خەنی بوو. بە هەمان شێوە مەیموونەکانیش سەرنجی ئەویان بەتەواوی بەلای خۆیاندا ڕاکێشابوو. ئیلینا ئیڤانۆڤنا بە شێوەیەکی زۆر عەیارانە و بە ڕووخسارێکی مەکربازانە لێی دەڕوانیم و تەواوی سەرنجی لەسەر من چڕ کردبووەوە. بەمەش دەیویست بێڕێزی بەرامبەر خاوەنی تیمساحەکە بکات و بەم کارەی سووکایەتیی پێ بکات.

قاقای لێئەدا و بە دڵی خۆی پێئەکەنی. چونکە ئەو هەر مەیموونە و لەگەڵ شێوەی ڕووخساری ناسیاوێکی یان هاوڕێیەک لە هاوڕێکانی دەچوواند.

تەنانەت منیشی سەرگەرم کردبوو بەو مەیموونانەوە، لەبەر ئەوەی هەر بەڕاستی ئەو لێکچوواندنانەی ئەو دەیکرد، زۆر لە ڕاستییەوە نزیک بوون. کابرای ئەڵمانی تیا مابوو کە ئایا بەڕاستی پێویستە پێبکەنێت یان پێنەکەنێت، لە کۆتاییدا، بڕیاری دا دەموچاوی بدا بە یەکا و خۆی گرژومۆن نیشان بدات لەبری ئەوەی پێبکەنێت.

ڕێک لەو کاتەدا، قیژەیەکی زۆر ترسناک هات، ئەتوانم بڵێم نەک هەر ترسناک، بەڵکوو زۆر لە ترسناک ترسناکتر، زۆر ناسروشتی، بە شێوەیەک، ئەو قیژەیە هێندە بەهێز بوو، ئەو ژوورەی خستە لەرزە. نەمزانی بیر لە چی بکەمەوە، یەکەم جار لە شوێنی خۆمدا بە پێوە وەستابووم، هێشتاش هەر سڕ و تۆقیو بووم، سەرنجم دا ئیلینا ئیڤانۆڤناش بە هەمان شێوە دەیقیژاند، بەخێرایی سەرم وەرچەرخاند - بەڵام چی ببینم! چیم بەرچاو کەوت، خودایە!

"ئیڤان ماتڤیتیچ"ی بەدبەختم لەناو شەویلگە ترسناکەکەی تیمساحەکەدا بینی، تیمساحەکە شەویلگەی لە ناوقەدی ئیڤان گیر کردبوو. بەتوندی و بە شێوەی ستوونی لە بۆشاییدا بەرزی کردبووەوە. ئیڤان ماتڤیتیچش لەوپەڕی نائومێدیدا لاقەی دەوەشاند. پاش یەک خولەک، هیچ شوێنەوارێک لە ئیڤان نەمایەوە. ئەبێت ئەم ساتەتان

بەوردی بۆ ڕوون بکەمەوە. چونکە لەم ساتەدا، بێ جووڵە لە شوێنی خۆم وشک ببووم و کاتی ئەوەم هەبوو تەواوی ئەو ڕووداوەی بە بەرچاومەوە ڕووی دا، بە کونجکاوی* و حەزێکی سەیر، کە هەرگیز پێشتر نەمبووە، ببینم. لەو ساتە شلۆقەدا بیرم لەوە دەکردەوە، کە ئەگەر ئەوەی بەسەر ئیڤان ماتڤیتیچدا هات، ئەگەر بەسەر خۆمدا بهاتایە، ئەبووایە ئێستا چ بارودۆخێکم هەبووایە!

ئەگەڕێمەوە سەر چیرۆکەکەم. تیمساحەکە، ئیڤان ماتڤیتیچی کەساسی لەناو شەویلگە ترسناکەکانی ئەهێنا و ئەبرد، بە شێوەیەک، کە سەرەتا لاقەکانی قووت دا، پاشان ئیڤان ماتڤیتیچی بەرز کردەوە، کە بەردەوام هەر لە هەوڵی ئەوەدا بوو، خۆی لە دەمی تیمساحەکە قوتار بکات و خۆی فڕێ بداتە دەرەوە و دەستەکانی توند لە ڕۆخی حەوزەکە گیر کردبوو، بەڵام هەوڵدان بێسوود بوو، چونکە تیمساحەکە تا توانیی بەخێرایی بەرزی کردەوە و تا ناوقەدیشی قووت دا. بەم شێوەیە ئیڤانی بەرز کردەوە، بۆ چەندجارێک و تا بەتەواوی قووتی دا...

ئا بەم شێوەیە ئیڤان ماتڤیتیچ لەپێش چاوەکانمان بزر بوو. لە کۆتاییدا، تیمساحەکە هاوڕێ ڕۆشنبیرەکەمی

---

* کونجکاو: بە کەسێک دەگوترێت، مەیلی زانیاریی زیاتری هەبێت لەسەر شتێک.

بۆ دواجار هەڵلووشی و هیچ شوێنەوارێکی لێ بەجێ نەهێشت. لە دیوی دەرەوەی جەستەی تیمساحەکە، ئەمانبینی چۆن سکی تیمساحەکە هەڵدەئاوسێ بە پەیکەری ئیڤان ماتڤیتیچ، کاتێک لەناو ورگی دەعباکەدا نغرۆ دەبوو.

لەوەدا بووم سەرلەنوێ پڕ بە گەرووم هاوار بکەم، کاتێک چارەنووس گەمەیەک لە گەمە بێبەزەییەکانی خۆی لەگەڵدا کردینەوە.

تیمساحەکە زۆر بەناڕەحەتی جووڵەی بۆ دەکرا. ڕەنگە هۆکارەکەی بۆ گەورەیی قەبارەی ئەو تەنە بگەڕایەتەوە، کە قووتی دابوو. جارێکی تر شەویلگە ترسناکەکانی کردەوە، لەگەڵ دوانزەگرییدا، لەپڕ ڕێی دا ئیڤان ماتڤیتیچ بۆ چرکەیەک سەری دەر بهێنێت، ئێمەش ڕووخساری نوقوومبوو و نائومێدیمان بینی. لەو کاتە کورتەدا، چاویلکەکەی لەسەر لووتی کەوتە خوارەوە بۆ ناو بنی حەوزەکە. وا دەر دەکەوت ئەم ڕووخسارە نائومێدە، سەری خۆی هێنابێتە دەرەوە، تا بۆ دواجار ماڵئاوایی خۆی لە هەموو ئەو تەنانەی چواردەوری و خۆشییەکانی دونیا بکات. بەڵام فریا نەکەوت ئەم ئامانجەی بەدی بهێنێت، چونکە تیمساحەکە بە یەک جووڵەی تر، دووبارە هەڵی لووشییەوە و لە بەرچاوانی نەهێشت، ئەمجارە، بۆ

هەمیشە لە بەرچاوان ون بوو. ئەم دیمەنی دەرکەوتن و ونبوونەی سەری مرۆڤێک، کە هێشتا زیندووە، زۆر سامناک بوو. چونکە ئەم ڕووداوە زۆر بەخێرایی و لەناکاو ڕووی دا، هەروەها کەوتنەخوارەوەی چاویلکەکە بۆ بنی حەوزەکە، دیمەنێکی پێکەنیناوی دروست کرد، لەناکاو دوور لە چاوەڕوانی خەریک بوو لە پرمەی پێکەنین بەم. بەڵام هەر زوو بەئاگا هاتمەوە و تێگەیشتم پێکەنین لە کاتێکی وادا کارێکی شیاو نییە، بەتایبەت بۆ من کارێکی نەشیاو بوو، لە کاتێکی وادا بە هاوڕێیەکی لەمێژینەی خێزانەکەم پێبکەنم، هەر بۆیە بەخێرایی ئاوڕم لە ئیلینا ئیڤانۆڤنا دایەوە و بە دەنگێک، کە پڕ بوو لە هەستی بەزەییپێداهاتنەوە، پێم وت:

"چیتر، ئێمە هیچ کارێکمان لە عۆدە نایەت بۆ ڕزگارکردنی ئیڤان ماتڤیتیچ، پێم وا بێت ئەو داماوە کۆتایی پێ هات!"

تەنانەت توانای ئەوەم نییە دژواریی بارودۆخی دەروونیی ئیلینا ئیڤانۆڤنا، لە کاتێکی لەم جۆرەدا ڕوون بکەمەوە. لەدوای یەکەم قیژەی، وا دەر دەکەوت لە شوێنی خۆیدا داکوترابێت بە زەوییەکەدا، شاهیدی بینینی تەواوی کارەساتەکە بوو؛ گەر لە چاوەکانیت بڕوانیایە، بۆت دەر دەکەوت چاوەکانی لە ترسا خەریکن لە کەللەسەرییەوە

دێنە دەرێ؛ پاشان کەوتە شیوەن و ڕۆڕۆ، بەڵام من دەستەکانیم گرت، بۆ ئەوەی هێوری بکەمەوە. لەم ساتەدا خاوەنی تیمساحەکە، کە ئەویش بە هەمان شێوە لە سەرەتادا دووچاری ترس ببوو، لەناکاو دەستەکانی لێک ئاڵاند و لە کاتێکدا چاوی بڕیبووە ژوورەوی خۆی، هاواری کرد:

"ئەی هاوار، تیمساحەکەم! ئەی هاوار، کارلشنە بچکۆلانە خۆشەویستەکەم! دایە، دایە، دایە*!"

لەم لاڵانەوەیەی کابرای ئەڵمانی، دەرگای ژوورەکەی پشتەوە کرایەوە. (دایە، ئافرەتێکی بەتەمەن دیار بوو، کولمەکانی سوور و کڵاوێکیشی لەسەردا بوو- ئەویش بە شینوشەپۆڕ خۆی گەیاندە کابرای ئەڵمانی.

هەرا و زەنایەکی شێتانە بەرپا بوو. ئیلینا ئیڤانۆڤنا شێتگیرانە ئەیقیژاند و هەر ئەم دەستەواژەیەی دەوتەوە:

"کەوڵی بکەن! کەوڵی بکەن!"

دیار بوو ئیلینا ئیڤانۆڤنا بۆ ساتێک وەک ئەوەی تووشی لەبیرچوونەوە بووبێت، هاواری لە دایە دەکرد، تا دایە، لە تۆڵەی هاوسەرەکەیدا، تیمساحەکەی بۆ کەوڵ بکات. خاوەنی تیمساحەکە و دایە، بچووکترین سەرنجیشیان بە

---

* زۆر جار لە زمانی ناوبازاڕیدا لە ئەڵمانیا، پیاو بە خێزانەکەی خۆی دەڵێت (دایە).

ئێمە نەدا. هەردووکیان وەک گوێرەکە سەریان بەسەر تیمساحەکەدا شۆڕ کردبووەوە و ئەیانبۆڕاند.

خاوەنی تیمساحەکە بە هاوارەوە وتی:

"خەتای خۆی بوو! ئەو هەر ئێستا دەتەقێنێت خۆی، لەبەر ئەوەی قووت دا لێپرسراوی گەورەی دەوڵەت!"

دایەش بە نووزەنووز وتی:

"کارلْشنە بچکۆلانەکەی ئێمە، کارلْشنە خۆشەویستەکەی ئێمە دەمرێت!"

خاوەنی تیمساحەکە دەنگی خستە پاڵ دەنگی دایە و وتی:

"ئێمە لەدەستمان چوو، سەرچاوەی ڕۆزی پەیداکردن!"

ئێلینا ئیڤانۆڤنا کە شینوشەپۆڕی نابووەوە، چمکێکی پاڵتۆی کابرای ئەڵمانیی گرتبوو، پێی دەوت:

کەولّی بکە! کەولّی بکە! کەولّی بکە!

کابرای ئەڵمانی لە کاتێکدا خەریکی ڕزگارکردنی چمکی پاڵتۆکەی بوو لەژێر دەستی ئێلینا ئیڤانۆڤنا، گووڕاندی بەسەریدا، وتی:

"خۆی سەری خستە سەر سەری تیمساحەکەم. بۆچی پیاوەکەت سەری خستە سەر سەری تیمساحەکەم؟ دەبێت بیدەیت قەرەبوو، بتەقێت ئەگەر کارلْشنە بچکۆلانەکەم، بە

هۆی پیاوەکەتەوە قووت دان، ئەبێت تۆ بدەیت باجەکەی، چونکە کوڕم بوو ئەم تیمساحە، تاقانە کوڕەکەم بوو!

خۆپەرستیی کابرای ئەڵمانی و دڵڕەقی و زبریی ژنەکەی، بەڕاستی زۆر دڵگرانی کردم... لە هەمان کاتیشدا، هاوارکردنەکانی ئیلینا ئیڤانۆڤناش لەولاوە بوەستێت، کە بەردەوام ئەم دەستەواژەیەی چەندبارە دەکردەوە: (کەوڵی بکەن! کەوڵی بکەن!) منی هێندەیتر جاڕز کردبوو و بە شێوەیەک، هەموو بیر و هۆشمی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. ئەتوانم ڕاست و ڕەوان، بێپێچوپەنا بڵێم، کە پەشێوییە نامۆکەی ئەو بەتەواوی تووشی سەرەگێژەی کردبووم، نەمەتوانی تێبگەم؛ بەڵام وای بۆ ئەچووم، کە ئیلینا ئیڤانۆڤنا بۆ چەند ساتێک ئاوەزی خۆی لەدەست دابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو باوەڕەدا بوو، کە تۆڵەی مێردە لەدەستچووەکەی "ئیڤان ماتڤیتچ" لە کەوڵکردن و پێستداماڵینی تیمساحەکەدا بەدی دێت، لە کاتێکدا ئەوە مەبەستی سەرەکیی ئەو نەبوو، بەڵکوو مەبەستێکی تەواو جیاوازی هەبوو.

بەدزییەوە ئاوڕم دایەوە بۆ لای دەرگاکە و لە چواردەوری خۆمم ڕوانی، بێ ئەوەی شەرم بکەم، داوام لە ئیلینا ئیڤانۆڤنا کرد و لێی پاڕامەوە تا بەسەر خۆیدا زاڵ بێت و چیتر ئەم ڕستە نەشیاوە، ((کەوڵی بکەن))،

بەکار نەهێنێت، چونکە ڕووهەڵماڵین لەسەر مەیلێکی ئاوا کۆنەپەرستانە تا ئەم ڕادەیە، لە شوێنێکی وەک ئەم شوێنەشدا، لە ناوەڕاستی گەلەرییەکەدا و لەنێوان ئەو خەڵکە ڕۆشنبیرەدا، لە بارودۆخێکی لەم جۆرەدا، نەک هەر کردەیەکی لۆژیکی نەبوو، بگرە هەر نابێت بیریشی لێ بکرێتەوە. لە کاتێکدا لەو نزیکانە، کە هەمووی چەند هەنگاوێک لەو شوێنەی ئێمەوە دوور نەبوو، هۆڵێکی لێ بوو، کە ڕێک لەو کاتەدا لەوێ بەڕێز "لاڤرۆڤ" خەریکی پێشکەشکردنی وتارێک بوو بۆ ئەو خەڵکە، ئەم خواستە کۆنەپەرستانەیەی ئیلینا ئیڤانۆڤنا، بۆی هەبوو لە هەرکاتێکدا بێت، ببێتە هۆی ئابڕووچوون. چونکە لەو کاتەدا ئەگەر هونەرمەندی کۆمیدی، بەڕێز "ستیپانۆڤ" لەوێ ئامادە بووایە، ئەگەری زۆر هەبوو ئەم هەلە بقۆزێتەوە و سبەینێ کۆمیدیایەکی لێ دروست بکات و بمانکات بە بنێشتەخۆشەی دەمی خەڵک لە ناوشار. بە ترسێکەوە بۆم دەر کەوت، کە گومانبردنەکەم لە جێی خۆیدا بوو، ئەو پەردەیەی کە ژووری تیمساحەکەی لە ڕاڕەوەکە جیا دەکردەوە - لەپڕ لا درا. جەستەیەک بە سمێڵ و ڕیشەوە و کڵاو بە دەستەوە، دەر کەوت. بەشی سەرەوەی جەستەی بەرەو پێشەوە بە درێژی چەماندبووەوە و سەری هێنابووە ناوەوە، بەڵام پێیەکانی بە نەزاکەتەوە لەپشتی ژووری تیمساحەکەوە شاردبۆوە

بۆ ئەوەی پێویست نەکات نرخی هاتنەژوورەوە بدات.
کابرای بێگانە، کە هەوڵی ئەوەی ئەدا پێ نەخاتە ژوورەکە، وتی:
"خانمەکەم، ئەم مەیلە کۆنەپەرستییەتان لەگەڵ پێگەی کۆمەڵایەتی و ئاستی ڕۆشنبیری و ژیریتان یەک ناگریتەوە، هۆی هەبوونی مەیلێکی لەم شێوەیە، هۆکارەکەی دەگەڕێنمەوە بۆ کەمیی ڕێژەی فسفۆڕ لە مێشکتاندا. بۆیە خۆتان ئامادە بکەن بۆ ئەو ئابڕووچوونەی لە گۆڤارەکەمان، گوڤاری (گەشتی ڕووداوەکان) لە ستوونی ڕەخنەییەکەیدا، ئەم قسە ئابڕووبەرانەتان چاپ دەکرێت و..."

بەڵام فریا نەکەوت لێدوانەکانی تەواو بکات؛ کاتێک خاوەنی تیمساحەکە بە خۆیدا دەهاتەوە، بە ترسەوە تەماشای کرد وا پیاوێک بێ ئەوەی پارەی هاتنەژوورەوە بدات، لە ژووری تیمساحەکەوە دەپەیڤێت، بەتووڕەیی بەرەو لای نوێخوازە نامۆکە ڕای کرد و بە دەستی نووقاوەوە کابرای بە بۆکس فڕێ دایە دەرەوە. بۆ ساتێک هەردووکیان لەپشت پەردەکەوە لە بەرچاومان دیار نەمان. دواتر تێگەیشتم تەواوی ئەو هەرا و زەنایەی ڕووی دا، لەسەر هیچ بووە. ئیلینا ئیڤانۆڤنا لەم مەسەلەیەدا بەتەواوی بێگوناه بوو؛ لە ڕاستیشدا ئەو مەبەستی ئەوە

نەبوو بە کەوڵکردنی تیمساحەکە، بیەوێت بە ئازاری جەستەیی ئەم گیاندارە سزا بدرێت، بەڵکوو دەیویست بڵێت بۆ دەرهێنانی هاوسەرەکەی لە سکی ئەو تیمساحە، ئەبێت ورگی تیمساحەکە هەڵدڕێندرێت.

بەڵام ئەڵمانییەکە لە کاتێکدا بەرەو لای ئێمە ڕای دەکرد، هاواری لێ هەستا و وتی:

"چی! ئاواتی ئەوە دەخوازیت تیمساحەکەم لەناو بچێت! نەخێر! با ڕێ بدەین یەکەم جار مێردەکەت لەناو بچێت، پێش تیمساحەکەی من...! باوکی من تیمساح نمایش کرد. باپیرەشم تیمساح نمایش کرد. کوڕەکەی منیش ئەبێت تیمساح نمایش بکات. منیش تیمساح نمایش دەکەم، هەمووان تیمساح نمایش دەکەن! من ناسراوم لە سەرانسەری ئەوروپا، بەڵام تۆ نەناسراویت لە سەرانسەری ئەوروپا، هەر بۆیە پێویستە لەسەرت، بکەیتەوە قەرەبووم!

دایەش بەوپەڕی توورەیییەوە وتی:

"بەڵێ، بەڵێ، ئێمە ناهێڵین تۆ هەر وا بەئاسانی لێرە بڕۆیت، ئەبێت قەرەبوومان بکەیتەوە، چونکە کارڵە بچکۆلانەکەمان خەریکە ئەتەقێت!"

هەوڵم دا هەرچی زووترە، ئیلینا ئیڤانۆڤنا بگەڕێنمەوە بۆ ماڵەوە، بۆیە بەهێمنی پێم وت:

"ڕاستیت بوێت، کەوڵکردنی تیمساحەکە تازە هیچ سوودێکی نییە، چونکە ئێستا ئیڤان ماتڤیتیچی خۆشەویستمان ڕەنگە ڕۆحی پەیوەست بووبێت بە دونیاکەی ترەوە!"

خۆشەویستم...!

لەپڕ تووشی سەرسووڕمانێکی لەڕادەبەدەر بووین، کاتێک گوێمان لە دەنگی ئیڤان ماتڤیتیچ بوو، وتی:

"خۆشەویستم! ئامۆژگاریت دەکەم هەرچی زووترە و بێ دواکەوتن بڕۆیتە لای بەڕێوەبەری پۆلیس، چونکە تا پۆلیس پێی نەخاتە ناو ئەم ئاریشەیەوە، ئەم ئەڵمانییە نالۆژیکییانە هەڵسوکەوت دەکات و لە هیچ شتێک تێناگات."

ئەم وشانە، کە بەوپەڕی بڕوابەخۆبوون و دڵنیاییەوە دەهاتە بەر گوێیان، نیشانەی بەڵگەنەویستی زیندوویی چاوەڕواننەکراوی ئەو بوو، بە شێوەیەک، کاتێک ئێمە گوێمان لەو قسانە بوو، بە جۆرێک تووشی سەرسووڕمان بووین، کە بڕوامان بە گوێیەکانی خۆمان نەدەکرد لەوەی بیستمان!

بەڵام بەدڵنیاییەوە، هەر کە گوێبیستی دەنگەکە بووین، بەخێرایی هەردووکمان ڕامان کرد بەرەو حەوزی تیمساحەکە. بە ڕێز و گرنگییەکی زۆرەوە، گوێمان بۆ بەندی بەدبەخت شل کرد. دەنگەکە کپ، ناسک، تەنانەت

زیاتر لە زیقەزیق دەچوو؛ لە دەنگێکی دوور دەچوو. ئەمە کەسێکی قۆشمەچی وەبیر هێنامەوە، کە بالیفێکی خستبووە سەر دەمی و لە ژووری تەنیشتەوە هاواری دەکرد، هەوڵی ئەوەی ئەدا دەنگی دوو جووتیار دەر بکات، کە بانگیان لە یەکتر دەکرد لە بیابانێکی کاکیبەکاکی یان لەناو شیوێکدا. ئەمەش بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەو گوێگرانەی ئامادەی بینینی ئەم جۆرە نمایشانە ئەبن. خۆشبەختانە یەک جار لە ئاهەنگی کریسمسدا لەماڵی یەکێک لە هاورێکانم، شاهیدی بینینی ئەم جۆرە نمایشە بووم.

ئیلینا ئیڤانۆڤنا، کە تووشی زمانگیران ببوو، وتی:

"ئیڤان ماتڤیتچی خۆشەویستم، کەواتە تۆ هێشتا زیندوویت!"

ئیڤان ماتڤیتیچ وەڵامی دایەوە:

"زیندووم و باشم. سوپاس بۆ خودای میهرەبان، تیمساحەکە بە جۆرێک قووتی دام، کە هیچ ئازارێکی پێ نەگەیاندم. تەنها شتێک کە جێگەی خەمی من بێت، ئەوەیە کە نازانم بەرپرسەکانم سەبارەت بەم پێشهاتە نائاساییەی بەسەرمدا هاتووە، چۆن بیر دەکەنەوە؛ دوای ئەوەی ڕووخسەتم وەرگرت بۆ ڕۆشتن بۆ ئەورووپا، بەڵام ئێستا وەک دەبینن لەناو سکی تیمساحێکدام، لە ڕاستیدا من لەمەدا نە فێڵم کردووە، نە گوناهێکیشم هەیە

سەبارەت بەمەی ڕووی داوە.

ئیلینا ئیڤانۆڤنا قسەکانی پێ بڕی و وتی:

"بەڵام خۆشەویستم، مێشکی خۆت بەوەوە سەرقاڵ مەکە کە فێڵت بەکار هێناوە یان نا؛ پیش هەموو شتێک، گرنگترین شت ئەوەیە بە چ ڕێگەیەک تۆ لەم شوێنەی ئێستات کە تێی کەوتوویت، دەر بهێنین.

خاوەنی تیمساحەکە هاواری کرد:

""دەرهێنان! ڕێگە نادەم بە کەس لە تیمساحەکەمەوە پەنجە بدات. ئێستا حەشامەتێکی زیاتر دێت، خەڵکێکی زیاتر، منیش پەنجا کوپیک وەردەگرم، زیادە و کارلشنی بچکۆلانەش ناتەقێت!"

دایەش ئەمەی بۆ زیاد کرد:

"سوپاس بۆ خودا!"

ئیڤان ماتڤیتیچ بە ئاوازێکی لەسەرخۆ وتی:

"ئەوان ڕاست دەڵێن. چونکە بنەما ئابوورییەکان لەپێش هەموو شتێکەوەیە!"

ئیلینا ئیڤانۆڤنا وتی:

"خۆشەویستم، من هەر ئێستا ئەچمە لای کاربەدەستانی دەوڵەت و لەوێ سکالایان لە دژ تۆمار دەکەم، چونکە وا دەر دەکەوێت خۆمان ناتوانین ئەم ئاریشەیە بەهێمنی

چارەسەر بکەین!

ئیڤان ماتڤیتیچ وتی:

"منیش هەمان بڕوام هەیە. بەڵام بە هۆی ئەم تەنگەژە ئابوورییەی لە سەردەمە پیشەسازییەکەماندا سەری هەڵداوە، هەڵدڕینی ورگی تیمساحێک و بەبێ پێدانی نرخی ئەو سکهەڵدڕینە، کارێکی زۆر ئاسان نییە. ئەو پرسیارەشی لێرەدا دێتە بەردەممان، ئەوەیە کە ئایا کابرای ئەڵمانی لە بەرامبەر هەڵدڕینی ورگی تیمساحەکەی، چەندێک پارەی دەوێت؟ کێشەیەکی تریش ئەوەیە، کە بە چ شێوەیەک پارەکە بدەین، چونکە خۆت باش ئەزانیت من لە دارای دنیا هیچ شک نابەم..."

بە ترسێکەوە وتم:

"پێم وا بێت لە مووچەی مانگانەکەت..."

بەڵام خاوەنی تیمساحەکە نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، خێرا پێی بڕیم و وتی:

من نافرۆشم تیمساحەکە؛ من ئەفرۆشم بە سێ هەزار تیمساحەکە! من بۆ چوار هەزار دەفرۆشم تیمساحەکە! ئێستا حەشامەت زیاتر دێن بۆ ئێرە. من بۆ پێنج هەزار ئەفرۆشم تیمساحەکە!

خاوەنی تیمساحەکە ئەم قسانەی بەوپەڕی شادییەوە دەکرد. چاوچنۆکییەکی بێسنوور لەگەڵ ڕژدییەکی

بێئابڕووانە لە چاوەکانیدا بڵێسەی دەدا.

من کە خەریک بوو دڵم ئەتەقی لەم قسانەی کابرای ئەڵمانی، بەوپەڕی تووڕەییەوە هاوارم کرد:

"من دەڕۆم"!

ئیلینا ئیڤانۆڤناش بە ناڵینەوە وتی:

"منیش ئێرە بەجێ ئەهێڵم! پێویستە بچم بۆ لای خودی ئاندرێ ئوسیپیچ، هەوڵ ئەدەم بە فرمێسکەکانم دڵی نەرم بکەم."

ئیڤان ماتڤیتیچ بەپەلە خۆی هەڵدایە ناو قسەکانی و وتی:

"ئەم کارە مەکە، خۆشەویستم..."

زۆر لەمێژ بوو کە ئیڤان ماتڤیتیچ بە هۆی ژنەکەیەوە ئیرەییەکی زۆری بە ئەندرێ ئوسیپیچ دەبرد، بۆیە دەشیزانی ئیلینا ئیڤانۆڤنا چێژ لەوە دەبینێت، کە لە بەردەم پیاوێکی خانەدان و ڕۆشنبیردا بگری، چونکە پێی وا بوو گریانی لێ دێت.

ئیڤان ماتڤیتیچ بەردەوامی بە قسەکانی دا و ڕووی قسەکانی کردە من:

هاوڕێی من، ئامۆژگاریی تۆش ناکەم کە ئەم کارە بکەیت. ئەم هەڵەشەییە هیچ سوودێکی نییە، چونکە

ئەنجامەکەی ڕوون نییە. باشترە هەر ئەمڕۆ بچیتە لای تیمۆفی سمیۆنیچ. خۆت نیشان بدە، وەک ئەوەی سەردانێکی ئاسایی بێت. ئەو کابرایەکی کۆنەخوازە، بەڵام بە هەرحاڵ، مرۆیەکی زۆر ژیرە، لەگەڵ ئەوەشدا، جێی متمانەپێکردنە، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر، کەسێکی زۆر ڕاشکاوە و چیی بوێت، ڕاستەوخۆ و بێ پێچوپەنا دەیڵێت. سڵاوی منی پێ بگەیەنە و سەرلەبەری چیرۆکەکەی بەوردی بۆ بگێڕەوە. حەوت ڕۆبڵی قەرزدارم، ئەو حەوت ڕۆبڵەشی لە دەرفەتی گونجاودا بۆ بگێڕەوە، چونکە کۆتا جار کە یاریی کاغەزمان کرد بەیەکەوە، حەوت ڕۆبڵم پێ دۆڕاند، بۆیە ئەرک بکێشە و لە کاتی گونجاودا ئەو حەوت ڕۆبڵەی بدەرەوە، بەڵکوو دڵی ئەو پیرەپیاوە بەوە نەرم بێت. بە هەرحاڵ، ڕەنگە ئامۆژگاری و ڕێنماییيەکانی ئەو بۆ ئێمە کەڵکێکی باشی هەبێت، لە هەمان کاتا، ئیلینا ئیڤانۆڤناشم تا ماڵەوە بۆ بگەیەنە...

پاشان، بۆ ئیلینا ئیڤانۆڤنا کەوتە ئاخاوتن وتی:

"خۆشەویستم، خۆت ئارام بکەرەوە، من لەدەست ئەم هاوار و قرەقرە ژنانەیەی تۆ ماندوو بووم، ئیستا پێم خۆشە سەرخەوێک بشکێنم. ئێرە گەرم و نەرمە، کاتێکی زۆر سەختم تێپەڕاند، تا لەگەڵ ئەم پەناگە چاوەڕواننەکراوەدا ڕاهاتم!"

ئێلینا ئیڤانۆڤنا بە دەنگێک، کە تژی بوو لە شادی، هاواری کرد:

"سەیری چواردەورت بکە! ئایا ڕووناکی لەوێ هەیە؟"

بەندی بەدبەخت پەرسڤی دایەوە:

"من لەناو دڵی تاریکیی شەودا بەند بووم، بەڵام هەستی خۆمم لەدەست نەداوە، هەروەها ئەتوانم قسە بکەم و بە دەستەکانیشم لەبری چاوەکانم لە چواردەوری خۆم بڕوانم... خودات لەگەڵ؛ ئارامگر بە و بیرت نەچێت، کە شادی بکەیت و بیر لەم ڕووداوە نەکەیتەوە. تا سبەینێ، خودات لەگەڵ! هەروەها تۆ، سیمیۆن سمیۆنیچ، ئێوارە بگەڕێرەوە بۆ لام. لەبەر ئەوەی مرۆیەکی، شت زوو لەبیر دەکەیت، هەر لەبەر ئەوە، دەستەسڕەکەت گرێ بدە، بۆ ئەوەی بکەویتەوە بیرت و بێیتەوە بۆ ئێرە!"

ئەبێت دانی پێدا بنێم، کە بە ڕۆیشتن لەو شوێنە ئاسوودە بووم. چوون بەڕاستی ماندوو بووم و تا ڕادەیەکیش بێزار بووم. خێرا باسکی خۆم بەرەو لای ئێلینا ئیڤانۆڤنای دڵشکاو – کە پشێوییەکە نازدارتری کردبوو، درێژ کرد. بەخێرایی لە ژووری تیمساحەکە هێنامە دەرەوە.

خاوەنی تیمساحەکە لەدوامانەوە بانگی لێ کردین:

"بۆ ئێوارە هاتنە ژوورەوە، زیاد دەکرێت بیستوپێنج

کوپیکی تر."

ئیلینا ئیڤانۆڤنا لە کاتێکدا لەناو هەموو ئاوێنەکانی سەر دیواری گەلەرییەکە، لە خۆی دەڕوانی پێدەچوو ئاگاداری ئەوە بێت، کە لە کاتە ئاساییەکانی تر جوانتر دەر دەکەوێت، وتی:

"ئاه.. گیانەکەم، چ مرۆڤگەلێکی پارەپەرست و چاو چنۆکن!"

شانازیم بەوەوە دەکرد، کە ڕێبوارانی سەر ڕێ باسکی خانمێکی ئاوا قەشەنگیان لە باسکمدا دەبینی. بۆیە بە بەسۆزییەکەوە وتم:

بنەماکانی ئابووری...

"بنەماکانی ئابووری...! لە کۆتاییدا من کەمێکیش چییە تێنەگەیشتم لەوەی کە تۆزێک بەر لە ئێستا، ئیڤان ماتڤیتیچ باسی ئەو شتە قێزەونە، بنەماکانی ئابووری، کرد، نازانم باسی چی کرد، نەمتوانی هیچ لە قسەکانی تێبگەم.

"من بۆت ڕوون دەکەمەوە."

دەستم کرد بە باسکردنی سوودەکانی ئەو سەرمایە دەرەکییەی لە دەرەوەی ڕووسیاوە دێتە ناوەوە، هەروەها جۆری ئەو کاریگەرییەی لەسەر ئابووریی ڕووسیا دەیبێت. هەڵبەت سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە، چەند وتارێکم

لەسەر ئەو بابەتە لە هەردوو ڕۆژنامەی ((پترزبۆرگ-نیوز)) و ((ڤۆیس)) خوێندبۆیەوە.

دوای ئەوەی بۆ ماوەیەک گوێی بۆ قسەکانم شل کردبوو، قسەکانی پێ بڕیم، وتی:

"ئەمە چەند سەیرە! بەڵام واز لەم قسانە بێنە، ساختەچی. چ قسەگەلێکی بێمانا دەکەیت... بەڕاست پێم بڵێ، ئایا ڕەنگپەڕیو دەر دەکەوم؟"

لە کاتێکدا لێی ورد ئەبوومەوە، بۆ وشەگەلێک ئەگەڕام، لەو وشانەی دڵی ئافرەتان خۆش ئەکات، وشەگەلێک، کە شیاوی وتن بێت، وتم:

"ئەوەی کەموکووڕی بێت لە تۆدا نییە، بگرە لەوپەڕی جوانی و دڵڕفێنیدایت!"

بە لەخۆڕازیبوونێکەوە وتی:

"زۆر زۆرزانیت!"

بۆ ماوەی خولەکێک بێدەنگ بوو. پاشان درێژەی دایەوە بە قسەکانی:

"ئیڤان ماتڤیتیچیی هەژار!"

پاشان سەری بە مەکربازییەکەوە جووڵاند و وتی:

"بەڕاستی بۆی بەداخم. ئای، خۆشەویستم!"

لەپڕ فرمێسکەکانی جۆگەلەی بەست و وتی:

"چۆن چۆنی ئەتوانێت نانی ئێوارە بخوات...ئەی... ئەی... ئەگەر شتێکی بوێت، ئەبێت چی بکات؟

"پرسیارێکی زۆر بەجێیە."

ئەم پرسیارە بەڕاستی شڵەژاندمی، ئەگەر ڕاستیتان بوێت، هەرگیز ئەم پرسیارە بە مێشکی مندا نەهاتبوو. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، خانمان لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕۆژانەی ژیان، لە پیاوان هۆشیارترن و پەی بە هەندێک شت دەبەن، کە ئێمەی پیاوان هەر بە بیریشماندا نایەت!

ئیلینا ئیڤانۆڤنا بەردەوامی بە قسەکانی دا:

"خۆشەویستە داماوەکەم! چۆن ئەم بەڵایەی بەسەردا هات... ئێستا هیچ شتێک نییە خۆی پێوە سەرقاڵ بکات لەناو ئەو تاریکییەدا... زۆر ناخۆشە کە هیچ وێنەیەکی فۆتۆگرافیم نییە، تا جاروبار یادی بکەمەوە... ئێستا وەک بێوەژن وام!"

پاشان بە پێکەنینێکی فریودەرانە، کە نیشانەی شادمانی بوو بەم دۆخە نوێیەی، وتی:

ئممم...! لەگەڵ ئەوەشدا من هەر بەزەییم پێیدا دێتەوە.

بەکورتی، ئەوەی ئیلینا ئیڤانۆڤنا دەیوت، وێنەدانەوەیەکی سروشتی و ژیرانەی خاتوونێکی گەنج و سەرنجڕاکێش و مێردلەدەستچوو بوو. لە کۆتاییدا ئەوم گەیاندەوەماڵەوە

و دڵنەواییم کرد، پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ لەگەڵیدا و خواردنەوەی فنجانێک قاوەی بۆندار، کاتژمێر شەش بەرەو ماڵی تیمۆفی سمیۆنیچ بەڕێ کەوتم.

بیرم لەوە دەکردەوە، کە لەم کاتژمێرەدا هەرچی ژن و مێردی خاوەنمنداڵە، لە ماڵەکانیان بەئاسوودەیی بۆ خۆیان لێی دانیشتوون یان لێی ڕاکشاون.

بەشی یەکەمم بە شێوەیەک نووسی، کە گونجاو بێت لەگەڵ گێڕانەوەی ڕووداوەکە. ئەمەویێت پاشماوەی ڕووداوەکە بە زمانێک بنووسم، کە سروشتیتر بێت و کەمتر بەرز و نزمی و دووبارەبوونەوەی تێدا بێت، هەر بۆیە لەم ڕووەوە ویستم خوێنەرەکانم لەم ڕاستییە ئاگادار بکەمەوە...

## (٢)

تیمۆفی سمیۆنیچی ڕێزدار، لە دۆخێکی تا ڕادەیەک شڵەژاو، وەک ئەوەی پەشۆکابێت، پێشوازی لێ کردم. بەرەو ژوورە بچووکەکەی ژووری خوێندنەوەگەی ڕابەری کردم و دەرگاکەی لەدوای خۆی بەوریاییی داخست. بە بێزارییەوە وتی:

"بەم شێوەیە منداڵەکان ناتوانن بێزارمان بکەن."

لەوێ، فەرمووی لێ کردم تا لەسەر کورسی تەنیشت مێزی نووسینەکەی خۆی دابنیشم و خۆشی لەسەر کورسییەکی نەرم و ئاسوودە لێی دانیشت. دامێنی ڕۆبەکەی لە ناوقەدی خۆی پێچا و بەمەش سیمایەکی زیاتر فەرمی و جەسوورانەی پێ بەخشی، بۆ ئەوەی ئامادەی ڕوودانی هەر پێشهاتێکی لەناکاو بێت، هەرچەندە ئەو نە سەرۆکی من بوو، نە سەرۆکی ئیڤان ماتڤیتیچ، تا ئەم ساتەش وەک هاوکارێک لێمان ڕوانیبوو،تەنانەت وەک هاوڕێیەکیش نا.

وتی:

"پێش هەموو شتێک، ئەبێت ئەوەت لە بەرچاو بێت، کە من کەسێکی خاوەن هێز و دەسەڵات نیم، بەڵکوو منیش کارمەندێکم لە پلەکەی تۆ و ئیڤان ماتڤیتیچ... کە لە ڕاستیدا بواری کارەکەی من پەیوەندیی بەم جۆرە بابەتانەوە نییە، پێشم خۆش نییە خۆم بگلێنمە ناو ئەم ئاریشەیەوە."

سەرم لەوە سووڕ ما، کە زۆر بەئاشکرا پێشتر هەموو شتێکی زانیبوو. بەڵام سەرەڕای ئەوەش، من سەرلەبەری چیرۆکەکەم بە تەواوی وردەکارییەکانییەوە بۆ گێڕایەوە. هەرچەندە من بەوپەڕی جۆشوخرۆشەوە قسەم دەکرد، چونکە لەو کاتەدا پێم وا بوو بە ئەرکێکی هاوڕێیەتی ڕاستەقینە هەستاوم. ئەو گوێی گرتبوو، بەبێ ئەوەی هیچ سەرسووڕمانێک بە خۆوە نیشان بدات، بەڵام بەڕوونی پێوەی دیار بوو، کە گومانی لە هەموو شتێک هەبوو.

وتی:

"تەنها خەیاڵ بوو! بەڵام هەمیشە لەو بڕوایەدا بووم، کە بەدڵنیاییەوە ئەم کارەساتەی بەسەردا دێت!"

"بۆچی تیمۆفی سمیۆنیچ؟ ئەمە پێشهاتێکی تەواو نائاساییە!"

"پەسەندمە کە پێشهاتێکی تەواو نائاساییە، بەڵام

ئەم شێوە ژیانە بێسەرەوبەرەیەی ئیڤان ماتڤیتیچ، هەر ئەم سەرئەنجامەی لێ چاوەڕوان دەکرا. لە ڕاستیدا، ئەو حولحولی و لەخۆڕازی بوو. هەمیشە لایەنگری لەم قسە پووچ و بێمانایە (پێشکەوتن) و چەند بیروباوەڕێکی تری پووچتر دەکرد. ئەنجامی ئا ئەمەیە بەرهەمی پێشکەوتن بۆ خەڵک!"

"بەڵام ئەمە ڕووداوێکی زۆر نائاساییە و ناکرێت ئەمە بکرێت بە یاسایەکی گشتی و بەسەر هەموو لایەنگران و ئەندامانی پێشکەوتندا بسەپێنرێت."

"بۆ نا! لە ڕاستیدا دەکرێت بەم شێوەیە بێت. سەیر بکە، من دڵنیات دەکەمەوە ئەمە لە ئەنجامی زیادلەپێویست خوێندنەوەی زۆرە. چونکە مرۆڤ کاتێک زیاد لەوەی کە پێویستە بخوێنێتەوە، زیاتر بخوێنێتەوە، پێی خۆشە سەر بکات بە هەموو کونێکا. بەتایبەت بۆ ئەو شوێنانەی نە کەس بانگهێشتی کردووە بۆی و نە کەس پێی وتووە بۆی بچێت."

پاشان وەک ئەوەی زویر و دڵڕەنجاو بێت لە خۆی، ئەمەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد:

"ڕەنگە خۆشتان باش ئەوە بزانن، کە من کابرایەکی بەساڵاچووم و لە ژیانیشما زۆرم نەخوێندووە. وەک کوڕی پیاوێکی سەرباز دەستبەکار بووم و ئەمساڵیش

ئاهەنگی پەنجاهەمین ساڵیادی خزمەتکردنم دەگێڕم."

"نا، نا، لە ڕاستیدا بەم شێوەیە نییە، تیمۆفی سمیۆنیچ. بەپێچەوانەوە، ئیڤان ماتڤیتیچ بەوپەڕی شەیداییەوە ئارەزووی بەدەستهێنانی ئامۆژگارییەکانی تۆ بوو؛ شەیدای ڕێنماییەکانتانە و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە ئەپاڕایەوە لێم، تا داواتان لێ بکەم ڕێنماییمان بکەیت."

"ئمم! کەواتە بەم شێوەیە، بە چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە! ئەم فرمێسکانە، فرمێسکی تیمساحین و مرۆ ناتوانێت بەتەواوی بڕوا بەو جۆرە فرمێسکانە بکات. پێم بڵێ، بە چ پارەیەک ئەیویست گەشت بکات بۆ ئەوروپا؟ ئەی چۆن بۆی لوا بڕوات؟ ئەو خۆ هیچ دەرامەتێکی تایبەتی نییە!"

بە غەمگینییەوە وەڵامم دایەوە:

"بەخششی چەند مانگی مووچەکەی پاشەکەوت کردبوو. تەنها ئەیویست بۆ ماوەی سێ مانگێک بچێت بۆ سویسرا... بەرەو خاکی ویلیام تێڵ."

"ویلیام تێڵ؟ ئمممم!"

"ئەیویست ئەم بەهارە لە ناپۆلی بەسەر بەرێت و بۆ دیدەنی مۆزەخانەکان و گیاندارەکان بڕوات و ئاشنایی پەیدا بکات لەگەڵ نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو شوێنانە."

"ئمممم! گیانداران! وا بۆی دەچم ئەمەی بەس بۆ

خۆهەڵکێشان و بەخۆدانازین کردبێت. چ گیاندارانێک؟ بۆ مەگەر بەپێی پێویست گیاندار لە وڵاتی خۆمان بوونی نییە؟ لە وڵاتەکەی خۆمان مۆزەخانە هەیە، پێشانگەی ئاژەڵانمان هەیە. حوشترمان هەیە، ورچمان هەیە کە لە نزیکی پترسبۆرگە! ئێستاش فەرموو، چۆتە ناو ورگی تیمساحێکەوە."

"ئاه.. تیمۆفی سمیۆنیچ، بەزەییت هەبێت! ئەو پیاوە لە کێشەدایە، داوای هاوکاریی لە ئێوە کردووە، وەک هاوڕێیەک هاوکاری بکەن، لە خزمێکی دووری خۆی داوای ڕێنمایی و ئامۆژگاری کردووە، کەچی تۆش هەر خەریکی لۆمەکردنیت. هیچ نەبێت بەزەییتان بە ئیلینا ئیڤانۆڤنای بێچارەدا بێتەوە!"

تیمۆفی سمیۆنیچ کە ناوی ئیلینای بیست، نەرم بوو و بڕنووتییەکەی بە حەزێکی زۆرەوە بۆن کرد و وتی:

"ئێوە باسی خێزانەکەی ئەو دەکەن؟ باسی خاتوونێکی دڵڕفێن و وردیلە، کە زۆر سەرنجڕاکێش و خرپنە و بەتایبەتی ئەو کاتانە زۆر سەرنجڕاکێشتر دەر دەکەوێت، کاتێک سەرە بچکۆلانە و جوانەکەی بە لایەکدا دەخات... بەڕێکەوت ئاندرێ ئوسیپچ چەند ڕۆژێک لەمەوبەر باسی ئەوی دەکرد."

"باسی ئەوی دەکرد؟"

"بەڵێ باسی ئەوی دەکرد بە وشەگەلێکی زۆر وروووژێنەر دەیگوت، لەو سینە و مەمکەی، لەو چاوانەی، لەو پرچە جوانەی... لەو لەشە شەکەرییەی، ئەیوت، ئەوە ئافرەت نییە...

"پاشان تیمۆفی سمیۆنیچ پێکەنی. درێژەی بە قسەکانی دا:

"بڵێین چی، ئاندرێ ئوسیپچ هێشتا گەنجە و دڵی تەڕە."

تیمۆفی سمیۆنیچ سەری بەرز کردەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە دەنگێکی بەرز لە کونەلووتەکانییەوە هەناسەکەی دایەوە و وتی:

"لەگەڵ ئەوەی هێشتا گەنجیشە، بەڵام لەم بەڕێزە بڕوانە چۆن ژیانی دەگوزەرێنێت..."

"تیمۆفی سمیۆنیچ، ئەمەی باسی دەکەیت دوورکەوتنەوەیە لە باسە سەرەکییەکەی خۆمان. ئەمە بابەتێکی ترە!"

"بێگومان. بێگومان."

"زۆر باشە، ئێستا تۆ ئەڵێی چی، تیمۆفی سمیۆنیچ؟"

"بۆچی، مەگەر من چ کارێکم لەدەست دێت؟"

"ئامۆژگاریمان بکە، ڕێنماییمان بکە، وەک مرۆڤێکی

خاوەنئەزموون، وەک ناسیاوێک! پێمان بڵێ پێویستە چی بکەین؟ چ هەنگاوێک پێویستە بنێین؟ بچین بۆ لای کاربەدەستانی دەوڵەت و...“

تیمۆفی سمیۆنیچ هەر گوێی لەم وشەیە بوو، بەپەلە وتی:

”بۆ لای کاربەدەستانی دەوڵەت؟ هەر بیریشی لێ نەکەنەوە. ئەگەر ئامۆژگاریی منتان دەوێت، باشترە پێش ئەوەی هەر هەنگاوێک بنێن، نەهێڵن کەس بەم کێشەیە بزانێت و هیچ کارێکی هەڵەشانە نەکەین و بابەتەکە لەنێوان خۆماندا بهێڵدرێتەوە. ئەمە ڕووداوێکی گوماناوی و نەزانراوە. سەرباری هەمووی، پێشتر لەم جۆرە ڕووداوە ڕووی نەداوە و ئاسان نییە، پێشبینیکردن و لەبەرچاوگرتنی چارەسەری پێشوەختە... بۆیە باشترە زۆر بەوریایی و بەژیرانە مامەڵە لەگەڵ ئەم کێشەیەدا بکرێت... لێگەڕێن با ماوەیەکی کەم لەوێدا ڕاکشێت. ئەبێت ئارام بگرین و چاوەڕێ بین بزانین چی ڕوو دەدات.“

”بەڵام تیمۆفی سمیۆنیچ، چۆن دەکرێت ئێمە ئارام بگرین و لە چاوەڕوانیدا بمێنینەوە، ئەی ئەگەر ئەو بەدبەختە لەناو سکی ئەو تیمساحەدا خنکا، چی بکەین؟“

”بەڵام بۆچی ئەخنکێت؟ ئەی خۆت بە منت نەوت کە وتوویەتی جێگەکەی گەرم و نەرمە؟“

سەرلەنوێ سەرلەبەری چیرۆکەکەم لە نوکەوە بۆ گێڕایەوە. تیمۆفی سمیۆنیچ کەوتەوە ناو دەریای قووڵی بیرکردنەوە. لە کاتێکا قووتووی بڕنووتییەکەی لەناو دەستەکانیدا هەڵدەسووڕاند، وتی:

"ئمممم! بە بڕوای من، ئەگەر لەبری ڕۆشتن بۆ ئەورووپا ماوەیەک لەوێدا ڕابکشێت، خراپ نییە. بهێڵن با لەوێ بۆ خۆی ئاسوودە بێت. بەدڵنیاییەوە نابێت بخنکێت، ئەبێت ئەویش کارێک بکات، تا بەسەلامەتی بمێنێتەوە. بۆ نموونە، ڕێگری لەوە بکات، کە تووشی کۆکە و ئەم شتانە ببێت... سەبارەت بە کابرای ئەڵمانیش، کە ئەمەیان ڕای خۆمە، ئەو لەسەر حەقە، چونکە ئەگەر ئێمە لە ڕوانگەیەکی ترەوە لە ڕووداوەکە بڕوانین، ئەبینین لایەنی یەکەم، ئەڵمانییەکە، خاوەنمافە بەسەر لایەنی دووەم، کە ئیڤان ماتڤیتیچە. چونکە لایەنی دووەم بەبێ وەرگرتنی ڕووخسەت، چۆتە ناو سکی تیمساحەکەوە! کابرای ئەڵمانی خۆ بەزۆر ئیڤان ماتڤیتیچی فڕێ نەداوەتە ناو سکی تیمساحەکەوە. تا ئەو جێگەیەی من بیرم بێت، ئیڤان ماتڤیتیچ تیمساحی نییە. لەبەر ئەوەی تیمساح موڵکێکی تایبەتی و کەسییە، هەر لەبەر ئەم هۆکارە، کە بەبێ قەرەبووکردنی نرخی تیمساحەکە، ناکرێت بە هیچ شێوەیەک ورگی تیمساحەکە هەڵبدڕێنرێت."

"بەڵام تیمۆفی سمیۆنیچ، ئەمە پەیوەندیی بە ڕزگارکردنی ژیانی مرۆڤێکەوە هەیە!"

"ئاهـ زۆر باشە، ئەمە کاری پۆلیسە. پێویستە لەسەرت بچیت بۆ لای پۆلیس."

"بەڵام ڕەنگە لە شوێنی کارەکەی، واتە بەڕێوەبەرایەتییەکەی، پێویستیان پێی بێت. ڕەنگە داوای بکەن."

"پێویستیان بە ئیڤان ماتڤیتیچ بێت؟ ها.. ها...! جاریَ پێش هەموو شتێک، ئەو لە پشوودایە و ئەتوانرێت ئامادەنەبوونی ئەو بەو هۆکارە لە بەرچاو بگیرێت. لێی گەڕێن با وڵاتانی ئەورووپی بگەڕێت! هەرکات پشووەکەی تەواو بوو و دەر نەکەوت، ئەوکات ئێمەش بەشوێنیدا دەگەڕێین!"

"سێ مانگ لەناو سکی تیمساحەکەدا بمێنێتەوە؟ تیمۆفی سمیۆنیچ بەزەییتان هەبێت!"

"خەتای خۆی بوو، کەس ئەوی بەزۆر فڕێ نەداوەتە ئەویَ. لەم قۆناغەدا، دەبێت ئێمە پەرستارێکی بۆ بدۆزینەوە، تا لەسەر خەرجیی دەوڵەت چاودێریی بکات. بەڵام کێشەکە لەوەدایە، ئەم بابەتە لە یاسادا ڕێی پێ نەدراوە. بەڵام ئەو شتەی پێویستە پێش هەموو شتێک لە بەرچاو بگیرێت، ئەوەیە کە تیمساحەکە موڵکی تایبەتییە

و ئەمەش لە بنەما ئابوورییەکاندا جێگەی خۆی هەیە، بنەماکانی ئابوریش لە سەروو هەموو شتێکەوەیە. هەر چەند شەوێک لەمەوبەر بوو لە ماڵی (لوک ئاندریچ)، (ئیگناتی پرۆکۆفیچ) سەبارەت بە زانستی ئابووری ئەم قسەیەی دەکرد. ئێوە ئیگناتی پرۆکۆفیچ دەناسن؟ ئەو سەرمایەدارێکی گەورەیە و قسەکەرێکی زۆر باشیشە. ئەو دەیوت، (ئێمە پێویستمان بە پێشکەوتنی پیشەسازی هەیە، چونکە تا ئێستا ئێمە پێشکەوتنێکی وەهامان بەدەست نەهێناوە لە ڕووی پیشەسازییەوە، بۆیە پێویست دەکات ئێمە ئەم پێشکەوتنە بەدی بهێنین، ئەمەش لە ڕێگەی سەرمایەدارییەوە دەبێت. پێویستە چینی ناوەند دروست بکەین، کە ناو دەبرێت بە (بۆرژوازی). بەڵام بە هۆی ئەوەی سەرمایەمان نییە، لەبەر ئەم هۆکارە دەبێت ئەو سەرمایەیە لە دەرەوە هاوردە بکەین. ئەبێت لە هەنگاوی یەکەمدا کارئاسانی بۆ کۆمپانیا دەرەکییەکان بکەین، تا بتوانن لە ڕووسیا زەوی بکڕن، هەر وەک چۆن لە زۆربەی وڵاتانی تر ئەم ئاسانکارییە دەکرێت. مولکدارێتی گشتی ژەهرێکی کووشندەیە، دارمانێکی گەورەیە، هۆکاری لەناوچوونی ڕووسیایە!) ئەزانی ئیگناتی پرۆکۆفیچ بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە قسەی دەکرد و مافی خۆشی بوو کە بەو شێوەیە قسە بکات، چونکە ئەو مرۆڤێکی دەوڵەمەندە و لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانبەری دەوڵەتیش

نییە. ئیگناتی دەیوت، (لە سیستەمی هاوبەشیتیدا، نە پیشەسازی پێشکەوتن بەدەست دەهێنێت نە کشتوکاڵیش.)
ئەو دەیوت کۆمپانیا بیانییەکان هەموو زەوییەکانمان بە شێوەی پارچەی گەورە گەورە بکڕن و پاشان ئەو پارچە گەورانە دابەش بکەن بۆ پارچەی بچووک بچووک، بەمەش لە موڵکی هاوبەش و کۆمەڵەوە ئەبێت بە موڵکی تاک. ئەزانیت، وشەی "دابەشکردن"ی زۆر بە خرۆشان و دانپێدانانێکی توندەوە دەگوت. ئەگەر قایل نەبووین بە فرۆشتنی زەوییەکانیشمان، ئەوە ئەتوانین بیاندەین بە کرێ. ئەمەشی خستە سەر قسەکانی و وتی، (هەرکاتێک سەرجەم زەوییەکانمان کەوتە دەست کۆمپانیا دەرەکییەکان، ئەو کاتە بەشی جووتیار بەئاسانی جیا دەکرێتەوە، بەم شێوەیە جووتیار لەسەری پێویست دەبێت کار بکات بۆ ئەوەی بژێوی خۆی بەدەست بهێنێت، دەشتوانرێت لەسەر ئەو زەوییە دەر بکرێت، ئەگەر پێویستی کرد. بۆیە هەرکات جووتیار هەستی بە بوونی ئەم مەترسییە کرد، ئەوکات ئەویش زیاتر ڕێزی موڵکەکە دەگرێت و زیاتر گوێڕایەڵ دەبێت، ئەوکات - سێ بەرامبەری پێشووتری کار دەکات و سێ - بەرامبەری جارانیش بەرهەمی زیا دەکات. بەڵام ئێستا کە هەست دەکات بەشێکە لە کۆمەڵ، هەموو شتێک بە چاوی سووک سەیر دەکات و گاڵتەی بە هەموو شتێک دێت. دەزانیت

ئەگەر بەباشیش کار نەکات ئەوا نامرێت لە برسا، بۆیە دەبینین کە هەموویان تەممەڵ و تەوەزەلن و هەمیشە سەرخۆشن. بەلام بەم ڕێگە نوێیە سەرمایەکە دێتە ناو ڕووسیا، بەم شێوەیەش سەرمایەداری دروست دەبێت و بۆرژوازییەتیش گەشە دەکات.)' لەم چەند ڕۆژەی ڕابردووشدا ڕۆژنامەی "تایمز"ی سیاسی و ئەدەبیی ئینگلیز، لە ستوونێکیدا وتارێکی سەبارەت بە بارودۆخی دارایی ڕووسیا نووسیبوو و ئاماژەی بەوە کردبوو؛ هۆکاری ئەوەی ئەم بارودۆخە داراییەی ڕووسیا جێگەی ڕەزامەندی نییە، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە لە ڕووسیادا چینی ناوەند و سەروەتی زەبەلاح و چینی کرێکاری گونجاو بوونی نییە!

ئیگناتی پرۆکۆفیچ زۆر بەجوانی قسە دەکات. ئەو بەڕاستی وتاربێژێکی بەتوانایە. لە بەرنامەیدایە کە ڕاپۆرتێک سەبارەت بەم بابەتە بۆ سەرووی خۆی بۆ دەسەلاتدارانی دەولەت بەرز بکاتەوە، بۆ ئەوەی بخرێتە بەر باس و لێکۆلینەوە و لە ڕۆژنامەکانیش بۆی بلاو بکەنەوە."

کاتێک تریمۆفی سمیۆنیچ ئەم قسانەی کرد، بۆم دەر کەوت تەواو جیاوازە لەو قسە شاعیرییانەی ئیڤان ماتڤیتیچ سەبارەت بەم کابرایە پێی وتم.

زۆربێژییەکەی پیرەپیاوم بڕی و وتم:

"بەڵام ئەی چارەنووسی ئیڤان ماتڤیتیچ بە کوێ دەگات؟"

تیمۆفی سمیۆنیچ کاتێک دەستی بە ئاخاوتن دەکرد، ئەیسەلماند کە لە کاروانی ڕۆژگار بەجێ نەماوە و بەڵکوو ئاگاداری هەموو گۆڕانکارییەکانیشە.

"سەبارەت بە چارەنووسی ئیڤان ماتڤیتیچ؟ بێگومان ئەچمە سەر ئەوەش. لەکوێدا بووین...؟ ئا، بیرم کەوتەوە، باسی ئەوەم دەکرد کە ئێمە ئارەزووی هێنانەناوەوەی سەرمایە دەکەین بۆ ناو وڵاتی خۆمان. ئەم بابەتە لەگەڵ ئەم ڕووداوەی ئیڤان ماتڤیتچ هەڵدەسەنگێنم؛ سەرمایەیەکی دەرەکی (تیمساح)ێک هێنراوەتە پترسبۆرگ، ئیڤان ماتڤیتیچیش نرخی ئەم سەرمایەیەی دووبەرامبەر کردووە. ئێمە لەبری پارێزگاریکردن لەو سەرمایەدارە بیانییە، کەچی پێشنیاری ئەوە دەکەین ورگی سەرمایە بنەڕەتییەکە، کە تیمساحەکەیە، هەڵبدڕین. ئایا ئەمە کارێکی ژیرانەیە؟ بە بیرکردنەوەی من، ئیڤان ماتڤیتیچ وەک کوڕی ڕاستی نیشتمانەکەی خۆی، ئەبێت شادمان و سەرفراز بێت و شانازی بە خۆیەوە بکات، چونکە بە هۆی ئەوەوە، نرخی تیمساحێکی دەرەکی دووقات یان تەنانەت سێقاتیش بەرز بووەتەوە. ئەمە ڕێک ئەو شتەیە،

کە وا دەکات سەرمایە بەلای خۆیدا ڕاکێشێت. ئەگەر یەک کەس لەم کارەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، بابەتەکە گرنگیی زیاتر پەیدا دەکات و یەکێکی تریش چاو لەو دەکات و بە تیمساحێکی ترەوە ڕوو لە ڕووسیا دەکات. پاشان سێیەمیش چاو لەوان دەکات و ڕەنگە دوو یان سێ تیمساح بە یەک جار لەگەڵ خۆیا بۆ ڕووسیا بهێنێت و ئا بەم شێوەیە سەرمایە گەشە دەکات. بەم جۆرە ئەبینە خاوەنی بۆرژوازییەتیش. ئەبێت ئەم کارە پاڵپشتی بکرێت."

هاوارم کرد، وتم:

"تیمۆفی سمیۆنیچ، تۆ ئەتەوێت ئیڤان ماتڤیتچی داماو، قوربانییەک بە خۆی بدات، کە لە سەروو توانای مرۆڤەوەیە!"

"من وەها کارێکم لەو نەخواستووە، داوا لە تۆش ئەکەم پێش هەموو شتێک، هەر وەک پێشتریش پێم وتن، لەبیرتان بێت من بەرپرسێکی دەوڵەت نیم و ناشتوانم داوای هیچ شتێک لە هیچ کەسێک بکەم. من تەنها وەک کوڕێکی ئەم نیشتمانە قسە ئەکەم، نەک وەک کوڕی باوکی ئەم نیشتمانە، تەنها وەک کوڕێکی ئەم نیشتمانە قسە ئەکەم. دووبارە لێت ئەپرسمەوە، چی بووە هۆکاری ئەوەی خۆی فڕێ بداتە ناو ورگی تیمساحەکەوە؟ ئایا پیاوێکی بەڕێز و خانەدان و خاوەن پێشینەیەکی باش

و ژیانی ژن و مێردایەتی بە یاسایی پێک هێنابێت، بەم شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات؟ ئایا بەڕاست، ئەمە کارێکی ژیرانەیە پێی هەستاوە؟"

"بەڵام ئەمە بەدەست خۆی نەبوو، ئەمە کارەساتە و بەسەریدا هاتووە."

"کێ ناڵێت کاری خۆی نەبووە؟ دوای ئەوەش، لەکوێوە پارە بهێنین تا قەرەبووی کابرای خاوەن تیمساح بکەینەوە؟"

"تیمۆفی سمیۆنیچ، تۆ بڵێی نەتوانین لە موچەکەی ئەو پارەیە دابین بکەین؟"

"ئنجا ئەو پارەی موچەیە بەش دەکات؟"

بە غەمگینییەوە وەڵامم دایەوە:

"نا، ئەو بڕەپارەیە بەش ناکات، تیمۆفی سمیۆنیچ، خاوەنی تیمساحەکە لە سەرەتای ڕووداوەکەدا لەوە دەترسا، کە تیمساحەکەی بتەقێت، بەڵام لە دواییدا کە بۆی دەر کەوت هەموو شتێک باشە، لە خۆشیدا خەنی بوو، چونکە ئەیتوانی نرخی هاتنەژوورەوە بۆ خانەی تیمساحەکە دووقات زیاد بکات."

"سێقات و ڕەنگە چوارقاتیش! ئێستا خەڵکی بۆ بینینی تیمساحەکە خرۆشاون و بەکۆمەڵ هێرش ئەبەن بەرەو گەلەرییەکە، بۆ بینینی تیمساحەکە، خاوەنانی تیمساحەکەش

مرۆگەلێکی زۆر ژیرن. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا چل ڕۆژەی بەڕۆژووبوون بۆ مەسیح ماویەتی و لەبەر ئەمە، جارێ خەڵک هەر مەیلی لە ڕابواردن و کەیف و شادییە. لەبەر ئەم هۆکارە، سەرلەنوێ قسەکانی پێشووم دووبارە دەکەمەوە، کە باشترین کار ئەوەیە، ئیڤان ماتڤیتیچ ئاشکرا نەکردنی خۆی بپارێزێت و پەلە نەکات. ڕێ بدەن هەمووان وا بزانن ئەو لەناو ورگی تیمساحەکەدایە، بەڵام ئەم شتە بە فەرمی لای کەس ئاشکرا مەکەن. لەبەر ئەوەی ئیڤان ماتڤیتیچ بارودۆخی باشە، بۆیە هەمووان پێیان وا دەبێت کە ڕۆشتووە بۆ ئەوروپا، بەڵام خۆی دەڵێت لەناو سکی تیمساحەکەدایە، ئێمەش خۆمان وا نیشان دەدەین، کە باوەڕمان بە قسەکەی نییە و قسەکەی پەسەند ناکەین. ئەبێت کارەکە بەم جۆرە ئەنجام بدرێت. باشترین شت ئەوەیە، کە چاوەڕێ بین؛ لە ڕاستیدا بۆچی ئەبێت ئیڤان ماتڤیتیچ پەلەی بێت؟"

"زۆر باشە، بەڵام ئەگەر..."

"خۆت نیگەران مەکە، ئیڤان ماتڤیتیچ لەشولاریکی باشی هەیە!"

"زۆر باشە، ئەی دوای ئەوە چی؟ هەتا کەی ئەبێت چاوەڕوان بێت؟"

لێت ناشارمەوە و ڕاستیت پێ بڵێم، ئەم بابەتە زۆر

سەیرە و مرۆڤ نازانێت چی بکات و بیر لە چی بکاتەوە، لە هەمووی خراپتر ئەوەیە، کە تا ئێستا هاوشێوەی ئەم ڕووداوە نەبینراوە. ئەگەر پێشتر ئەمە ڕووی بدایە، ڕەنگە ئەوکات چارەسەرێک هەبووایە لە بەردەستماندا. بەڵام لەم دۆخەدا، نازانم چی بڵێم؟ بەدڵنیاییەوە بە تێپەڕینی کات، ڕێگەچارەیەکیش ئەدۆزرێتەوە!"

لەو کاتەدا بیرۆکەیەکی دڵخۆشکەرانە بروسکەئاسا هات بە مێشکما و بیری ڕووناک کردمەوە و وتم:

"ئەگەر چارەنووس ڕێ بدات ئەو بەزیندوویی لەناو سکی تیمساحەکەدا بمێنێتەوە، ئایا ناتوانین ئامادەکارییەکی وا بکەین، کە سکاڵانامەیەک بنووسێت، کە هێشتا هەر خەریکی خزمەتکردنە بە دەوڵەت؟"

"ئمم...! ڕەنگە بتوانرێت پشووی بێمووچە داوا بکات!"

"ئەی ناکرێت پشووەکەی مووچەشی لەگەڵدا بێت؟"

"لەسەر چ بنەمایەک؟"

"وەک ئەوەی نێردرابێت بۆ بەجێهێنانی ئەرکێکی تایبەتی!"

"بۆ چ ئەرکێک و لە چ شوێنێکیش؟"

"ئەرکی لێکۆڵینەوە لە تیمساح و چوونەناو ورگی تیمساح و پشکنینی... کە دەتوانین بڵێین، سەرقاڵی

دۆزینەوە و پشکنینین و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی تیمساحە. بەدڵنیاییەوە شتێکی نوێ دەبێت، هەروەها پیشکەوتنخوازانەش دەبێت و لە هەمان کاتیشدا نیشاندانی حەزێکی ڕۆشنبیرانەیە."

پێشنیارەکەم بۆ ساتێک تیمۆفی سمیۆنیچی خستە ناو گێژاوی بیرکردنەوەوە. دواجار کەوتەوە قسەکردن و وتی:

"بە بڕوای من، ناردنی کارگێڕێکی تایبەتی بۆ ناو لاشەی تیمساحێک و لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم گیاندارە، کارێکی بێسوودە، چونکە ئەمە لە پەیڕەودا بوونی نییە. جگە لەوەش، ئەبێت چ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەناو سکی تیمساحدا بکرێت؟"

"خوێندنەوەیەکی زانستی و سروشتییانە بۆ گیاندارێکی زیندوو لە نزیکەوە. لەم سەردەمەدا، زانستی سروشتی زۆر جێگەی سەرنجە... ئەو دەتوانێت لەوێدا بژی و ئەوەی دەیبینێت بیکات بە ڕاپۆرت... بۆ نموونە، دەربارەی چۆنیتی هەرسکردن یان هەر خوویەکی سادە، یاخود لەبەر خاتری کۆکردنەوەی ڕاستییەکان."

"مەبەستت ئەوەیە وەک ئامار. چاکە، بەلام من لەم بابەتە زۆر سەرم لێی دەر ناچێت، ڕاستیت بوێت، من ئەسڵەن فەیلەسوف نیم. تۆ دەڵێیت 'ڕاستی' ئێمە بەڕاستی چواردەورمان تەنراوە و ناشزانین چی لەو ڕاستییانە

بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا، ئامار ترسناکە."

"لە چ ڕوویەکەوە؟"

"هەمووی ترسناکە. سەرەڕای ئەوەش، ئایا خودی خۆت باوەڕ بەوە دەکەیت، کە ئەو بتوانێت ڕاستییەکان ڕابگەیەنێت، لە کاتێکدا وەک کۆتەرەدارێک ڕاکشابێت. ئایا کەسێک ئەتوانێت ئەرکە سەرەکییەکانی خۆی بەجێ بهێنێت، لە کاتێکدا وەک کۆتەرەدار لێی ڕاکشابێت؟ ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێت بە شتێکی نوێتر و مەترسیشی لەوەی یەکەم زیاتر دەبێت؛ دووبارە پێتان ڕادەگەیەنمەوە، کە ئەم ڕووداوە پێشتر ڕووی نەداوە و ئەگەر ڕووی بدایە، بێ هیچ گومانێک ڕێک ئەم ئەرکەیان بەو دەسپارد!"

"بەڵام تیمۆفی سمیۆنیچ، تا ئێستا تیمساحی زیندوو نەهێنراوەتە ڕووسیا."

دووبارە بەرپەرچی دامەوە:

"ئممم...! بەڵێ. بەرهەڵستییەکەی تۆ بەجێیە، هەڵبەت ئەگەر حەز بکەیت، بەڕاستیش بەشوێن بابەتەکەوە بیت، ئەبێت ئەوەش لە بەرچاو بگریت، کە لە ڕوویەکی ترەوە بە هاتنەناوەوەی تیمساحگەلێکی زیندوو بۆ ناو ڕووسیا، ئەبێتە هۆی ئەوەی فەرمانبەرانی کارگێڕیی دەوڵەت یەک لەدوای یەک دیار نەمێنن. لەبەر ئەوەی ناو سکی تیمساحەکە گەرم و نەرمە، بۆیە هەموویان داوای مانەوە

ئەکەن لەسەر کارەکەیان! ئەمە لە کاتێکدا جێگەی خۆیان خۆش کردووە و تەممەڵخانەیەکی باشیان دۆزیوەتەوە بۆ خۆیان... ئەبێت ئێوە ئەوەتان پەسەند بێت، کە ئەم کارە، ئاکامی باش نابێت و ئەبێتە نموونەیەکی خراپ، چونکە هەمووان بێ ئەوەی هیچ کارێک بەئەنجام بگەیەنن، داوای مووچەی خۆڕاییش لە دەوڵەت دەکەن!"

"تیمۆفی سمیۆنیچ، چیتان لەدەست دێت بۆ ڕزگارکردنی، تکایە درێغی مەکەن لە کردنی، شتێکی تریش، ئیڤان ماتڤیتیچ داوای لێ کردم ئەو حەوت ڕۆبڵەتان بۆ بگێڕمەوە، کە دوایین جار لە یاریی کاغەزدا پێی دۆڕاندبوون."

ئاها! لە ماڵی نیکیفۆر نیکیفۆریچ پێی دۆڕاندم. ئێستا بیرم کەوتەوە، چەند بەکەیف و دڵخۆش بوو... بەڵام ئێستا!

پیرە پیاو تۆزێک بێتاقەت بوو، هەستم کرد بەزەییی بە ئیڤان ماتڤیتیچدا ئەهاتەوە.

"تیمۆفی سمیۆنیچ لەبەر خاتری ئەو هاوڕێیەتییەتان یارمەتی بدەن."

"من تەواوی توانای خۆم ئەخەمە گەڕ بۆ یارمەتیدانی. من بەناوی خۆمەوە قسە دەکەم، وەک کەسێکی نهێنیش زانیاری کۆ دەکەمەوە. لە هەمان کاتا، ئێوەش بە شێوەیەکی

ناڕاستەوخۆ و نافەرمی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بکەن و بزانن خاوەنی تیمساحەکە لە قەرەبووی هەڵدڕینی ورگی تیمساحەکەی، چەندێکی دەوێت؟"

تیمۆفی سمیۆنیچ لەپڕ زۆر هاوڕێیانە قسەی دەکرد، منیش وەڵامم دایەوە!

"بەدڵنیاییەوە ئەم کارە ئەنجام دەدەم و یەکسەر ئەشگەڕێمەوە بۆ لاتان، تا ئەنجامی کارەکەتان پێ ڕابگەیەنم!"

ئەی خێزانەکەی... ئایا تەنیایە ئێستا؟ ئایا دڵتەنگ و غەمگینە؟"

"پێویستە سەردانێکی بکەن، تیمۆفی سمیۆنیچ!""

"بێگومان سەردانی ئەکەم. خۆشم هەمان نیازم هەبوو. دەرفەتێکی باشە... ئەبێت چ شتێک لەم دنیایەدا بووبێت بە هۆکاری ئەوەی بچێت بۆ تەماشاکردنی تیمساحەکە، هەرچەندە خودی خۆشم بە خراپی نازانم، کە تیمساحەکە ببینم.

"تیمۆفی سمیۆنیچ، بڕۆ و ئەو هاوڕێ داماوەت ببینە."

"بەدڵنیاییەوە ئەم کارە دەکەم، بەڵام دڵم نایەت بە بینینی من ئومێدەوار بێت. هەر لەبەر ئەمە، بە شێوەیەکی نەناسراو بۆ ئەو شوێنە ئەڕۆم... زۆر باشە، خودات لەگەڵ. من دووبارە سەرێک ئەیەمەوە لە ماڵی نیکیفۆر

نیکیفۆریچ. ئایا تۆ نایەیت لەگەڵما؟"

"نا، من ئەچم بۆ بینینی ئەو بەندییە هەژارە."

"بەڵێ، ئێستا ئەو بەندییە...! ئاهـ ئا ئەمەیە ئەنجامی بێمێشکی و بیرنەکردنەوە!"

ماڵئاواییم لە پیرەپیاو کرد. بیری جۆراوجۆر لە مێشکما ئەهات و ئەچوو. تیمۆفی سمیۆنیچ مرۆیەکی خۆشخولق و زۆریش ڕاستگۆ بوو. کاتێک کە بەجێم هێشت، خۆشحاڵ بووم کە ئاهەنگی پەنجاهەمین ساڵیادی خزمەتکردنی خۆی دەگێڕێت، چونکە مرۆڤانێکی هاوشێوەی ئەو، لەناو ئێمەدا نموونەیان دەگمەنە. خێرا و بێ دواکەوتن خۆم گەیاندە گەلەرییەکە، بۆ ئەوەی هەموو ئەو هەواڵانە بۆ ئیڤان ماتڤیتیچی بەدبەخت بگێڕمەوە. بەڵام ڕاستیتان بوێت، مەراقی ئەوە لێی دابووم، کە چۆن لەناو سکی ئەو تیمساحەدا ڕۆژەکانی بەڕێ دەکات و چۆن دەتوانێت بژی. ئایا هەر بەڕاستی ئەتوانرێت لەناو سکی تیمساحێکدا بژی؟ بەڕاستی لەو کاتەدا هەموو شتێک بۆ من وەک خەیاڵێکی نائاسایی ئەهاتە پێش چاو، وەک کابوسێکی ناخۆش، بە تایبەتی ئەو کاتەی لە کابوسەکەتدا دەعبایەک لێت ئەبێت بە هەموو شتێک.

## (٣)

ئەوەی کە ئەمبینی، خەون نەبوو. بەڵکو ڕاستییەکی بێ چەنوچوون بوو. چونکە ئەگەر ڕاستی نەبووایە، ئایا ئەمتوانی هەر لەخۆمەوە ئەم چیرۆکە دروست بکەم و بیگێڕمەوە؟ بە هەرحاڵ، بەردەوام ئەبم لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان.

کات درەنگی کردبوو. دەوروبەری کاتژمێر نۆ بوو، کە گەیشتمەوە گەلەرییەکە. لەبەر ئەوەی ئەو ئێوارەیە کابرای ئەڵمانی زووتر لە کاتی ئاسایی خۆی دەرگای دوکانەکەی داخستبوو، ناچار لە دەرگای پشتەوە خۆم کرد بە ژووری تیمساحەکەدا. کابرای ئەڵمانی لە خەڵوەتی تەنیاییی خۆی، لە کاتێکا کەوا چڵکن و کۆنەکەی لەبەردا بوو، خەریکی پیاسەکردن بوو. بەڵام وا دەر دەکەوت سێهێندەی بەیانی دڵخۆشتر بێت. ئاشکرا ئێستا نیگەرانی هیچ شتێک نەبوو، چونکە حەشامەتێکی "زۆر زیاتر" لە خەڵکی هاتبوون بۆ بینینی تیمساحەکە. دواتر دایە خۆی

کرد بە ژوورەوەدا، ئاشکرا بوو، بۆ ئەوەی چاوێکی لەسەرم بێت. لەگەڵ ئەوەی دەرگای گەلەرەییەکەش داخرابوو، کەچی بیستوپێنج کوپیکیان بۆ هاتنەژوورەوە لێ سەندم. چەند ورد بوون لە پارەوەرگرتنا!

کابرای ئەڵمانی لێم نزیک بووەوە و پێی وتم:

"تۆ هەموو جارێک نرخی هاتنە ژوورەوە بدەیت؛ خەڵکی تر یەک ڕۆبڵ، تۆ بیستوپێنج کوپیک دەدەیت؛ لەبەر ئەوەی ئێوە هاورێی باش بۆ هاوڕێ باشەکەتان؛ منیش ڕێز لە هاوڕێ..."

گوێم بۆ تەواوکردنی قسەکانی نەگرت و لە تیمساحەکە نزیک بوومەوە. بە جۆرێک هاوارم کرد، کە ئیڤان ماتڤیتیچ لە دوورەوە گوێبیستی دەنگم بێت و بزانێت من لێرەم!

"تۆ زیندوویت؟ تۆ زیندوویت، هاوڕێ ڕۆشنبیرەکەم؟"

"زیندوم و بارودۆخیشم زۆر باشە!"

لەگەڵ ئەوەی لە نزیکیشییەوە وەستابووم، بەڵام وەک ئەوە بوو دەنگی لە دوورەوە یان لەژێر تەختەخەوەوە بێت.

"زیندووم و بارودۆخیشم زۆر باشە! بەس چاکی و خۆشی هەڵگرە بۆ دوایی... پێم بڵێ بزانم چیت کرد؟"

وا خۆم دەر خست، کە گوێم لە پرسیارەکەی

نەبوو بێت، بۆیە بەخێرایی و دڵپیسووتانێکەوە بە هەستێک پڕ لە بەزەیی پرسیارم لێ کرد، کە بارودۆخی چۆنە و چ هەستێکی هەیە لەناو سکی تیمساحەکەدا؟ لە ڕاستیدا پرسیارلێکردنی ئەو لەم بارەیەوە، هیچ نەبوو جگە لە ئەرکێک لە ئەرکەکانی هاوڕێیەتی، ئەمە ئەرکێکی ئاکاری بوو، کە دەبوو پێی هەڵسابام. بەڵام ئیڤان ماتڤیتچ بەبێزاری و نائارامییەوە قسەکەی بڕیم و بە هاوارێکی هەژێنەر و بەرزەوە، کە هەمیشە بەو شێوەیە بانگی لێ دەکردم، وتی:

"شتەکان چۆن ئەڕۆنە پێشەوە؟"

تەواوی گفتوگۆکەی نێوان خۆم و تیمۆفی سمیۆنیچم مووبەموو بۆ گێڕایەوە، لە کاتی گێڕانەوەکەمدا، هەوڵم دا دەنگم وا لێ بکەم کە هەست بە جاڕزیم بکات. ئیڤان ماتڤیتیچ هەر وەک هەموو جارێک کە قسەی لەگەڵ دەکردم، بەخێرایی وتی:

"پیرەپیاو هەرچییەکی وتووە، ڕاستی وتووە. من پیاوی کردەنیم زۆر خۆش ئەوێت و بەپێچەوانەوە، پیاوی بوودەڵە و سەرژنانیم خۆش ناوێت. من ئامادەم پێشنیارەکەی تۆ سەبارەت بە ئەرکە تایبەتییەکە پەسەند بکەم، چونکە بیرۆکەیەکی خراپ نییە. بێ هیچ گومانێک، ئەتوانم لێرەوە ڕاپۆرت لەسەر هەردوو بابەتەکە، زانستی

و ئاکاریش، بخەمە بەرچاو. بەڵام ئێستا بارودۆخێکی نوێ و دوورلەچاوەڕوانی هاتۆتە پێش، کە هیچ نیگەرانییەک سەبارەت بە مووچەی مانگانەکە ناهێڵێتەوە، لە ڕاستیدا مووچەکە هەر کێشە نابێت بیدەن یان نەیدەن. باش گوێ بگرە، ئایا لەسەر زەوی دانیشتوویت؟"

"نا. بەپێوە وەستاوم."

"ئەگەر هیچی لێ نییە لەسەری دانیشیت، ئەوە لەسەر عەردەکە دانیشە و زۆر بەوردی گوێم لێ بگرە."

بەوپەڕی جارزییەوە کورسییەکم هەڵگرت و بەوپەڕی تووڕەیییەوە لەسەر زەوییەکە دام نا، بە شێوەیەک کورسییەکەم یا بە ئەرزا، کە دەنگێکی زۆر بەرزی لێ بەرز بووەوە.

ئیڤان ماتڤیتیچ بە زمانێکی دیکتاتۆرانە وتی:

"گوێ بگرە، ئەمڕۆ حەشامەتێکی زۆر بۆ تەماشاکردنی تیمساحەکە هاتن، بە شێوەیەک، کە نزیکی خۆرئاوابوون دەرزیت هەڵبدایە، نەئەکەوتە سەر زەوی، تەنانەت وای لێ هات پۆلیس بۆ هێمنکردنەوەی ڕەوشەکە دەستبەکار بوون. خاوەنی تیمساحەکە بە پێویستی زانی دەرگای دوکانەکەی لە کاتژمێر هەشتدا دابخات و کۆتایی بە پێشانگەکە بهێنێت، واتە زووتر لە کاتی ئاساییی خۆی، بۆ ئەوەی ئەو پارانە بژمێرێت، کە لە خەڵکی وەرگرتبوو

و بتوانێت خۆشی گونجاوتر ئامادە بکات بۆ سبەینێ.
بەم شێوەیە، دڵنیام کە سبەینێ پێشانگەکە ڕێکوپێکتر
دەبێت و ئەتوانین وای دابنێین، کە زۆرترین خەڵکی
ڕۆشنبیری پایتەخت، هەر لە خانمانی خانەدان، باڵوێزانی
بیانی، پارێزەران و خەڵکی تریش لە هەموو چین و
توێژەکانی کۆمەڵگە، لێرە ئامادە دەبن. لە هەمووشی
گرنگتر، خەڵکی لە دوورترین ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتە
گەورە و سەرنجڕاکێشەکەمانەوە بەرەو پایتەخت، واتە
بەرەو ئێرە، بەڕێ دەکەون. ئەنجامەکەشی ئەوەیە، کە
من ئەبم بە قیبلەی بەرچاوی هەمووان، هەرچەندە
لەبەرچاوانیش نیم، بەڵام هەر وەک کەسێکی بەرجەستە
و شکۆمەند ئەژمار دەکرێم. من ئەبێت خەڵکی بێکار فێر
بکەم. بە ئەزموون فێر بووم، کە پێویستە من نموونەیەک
بم لە شکۆداری، هەروەها ملەکەچبوویەکی چارەنووس!
ئەبم بە مینبەرێک، کە لێیەوە وتەی جوان و گەورە
پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکرێت. مرۆڤەکان تێدەگەیەنم،
کە تەنها ئەو زانیارییە زیندەوەرزانییەی لەناو سکی ئەم
تیمساحە بەدەستم هێناوە، ئەوە بە هیچ نرخێک بەدەست
ناهێنرێت. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە، کە بەداخ نیم بۆ
ئەوەی کە بەسەرما هاتووە، وە پێشبینی ئەوە دەکەم کە
کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لەسەر ژیان و داهاتووی
کارەکەشم!"

به توانجەوە پرسیارم لێ کرد:

"هەست بە ماندووبوون ناکەیت؟"

ئەوەی کە منی زۆر بێزار کرد، فشەفشکردنەکەی بوو. بەڵام بە خۆمم گوت، گرنگ نییە، ئەوە پەیوەندیی بە منەوە نییە. ئەم پیاوە خەڵەفاوە ئەبێت چ شتێکی لەم سەر زەوییە چنگ کەوتبێت، تا بەم شێوە شانازی بە خۆیەوە ئەکات؟ لەبری ئەوەی شانازی بە خۆیەوە بکات، ئەبووایە ئێستا بگرییایە بۆ باردۆخی خۆی.

ئیڤان ماتڤیتیچ بەتوندی وەڵامی پرسیارەکەمی دایەوە:

"نەخێر! ماندوو نیم، چونکە پڕم لە بیرۆکەگەلێکی مەزن. ئێستا دەرفەتێکی باشم دەست کەوتووە، تا دەربارەی باشترکردنی بارودۆخی ژیانی زۆرێک لە مرۆڤەکان بیر بکەمەوە، لەناو سکی ئەم تیمساحەدا، ڕاستی و ڕووناکیم بەسەردا ئەبارێت! بەدڵنیاییەوە، گەشە بە بیردۆزێکی نوێی ئابووری دەدەم، کە لەلایەن خۆمەوە دەبێت و شانازیشی پێوە دەکەم - کە تا ئەم ساتە بە هۆی سەرقاڵی و گیرۆدەبوون بەدەست کارە کارگێڕییەکان و خۆشگوزەرانییەکانی ژیان و چەند شتێکی هیچوپووچی ترەوە، نەمتوانیبوو کاتێکی بۆ تەرخان بکەم. من هەرچی بیردۆزەکانە، بە درۆی دەخەمەوە و ئەبێت ببم بە (فۆریە)یەکی نوێ. با لەوە گەڕێین، ئەرێ حەوت

ڕۆبڵەکەت گەڕاندەوە بۆ تیمۆفی سمیۆنیچ؟"

"بەڵی، لە گیرفانی خۆم بۆم گەڕاندەوە!

ئەم قسەیەم بە جەختلێکردنەوەوە وت. ئەویش بە فیزێکەوە وەڵامی دامەوە:

"ئەو برەپارەیەت بۆ ئەگێڕمەوە... زۆر دڵنیام کە مووچەکەم زیاد دەکرێت، چونکە ئەگەر بۆ منی زیاد نەکەن، ئەبێت بۆ کێی زیاد بکەن؟ ئێستا گەورەترین خزمەت پێشکەش دەکەم. با بگەڕێینەوە سەر قسەکانمان. خێزانەکەم خەریکی چییە؟"

پێم وا بێت مەبەستت ئیلینا ئیڤانۆڤنایە؟"

هاواری لێ بەرز بووەوە، توند هاواری کرد:

"خێێێێێزانەکەم؟"

چارەم نەبوو. سەرم داخستبوو گوێڕایەڵانە - بەڵام لە کاتێکدا لە تووڕەییدا دانەجیرەم پێ کەوتبوو- ویستم باسی ئەوەی بۆ بکەم، کە چۆن ئیلینا ئیڤانۆڤنام بەجێ هێشت. بەڵام هێندە جیکڵدان تەنگە بوو، نەیهێشت قسەکانم بکەم، بێئارامانە وتی:

"پلانی بێوێنەم پێیە بۆ خێزانەکەم. ئەگەر من لێرە جەژن بگێرم، پێم خۆشە ئەویش لەوێ جەژن بگێڕێت. ئەگەر من ناوبانگ دەر بکەم، ئەبێت ئەویش ناوبانگ

دەر بکات، چونکە خێزانی منە. فێرخوازان، شاعیران، فەیلەسوفان، کانزاناسانی بیانی و سیاسەتمەداران، هەر کە بەیانی لێرە لەگەڵ من دیداریان کرد، ئەوە شەوەکەشی سەردانی دیوەخانەکەی ئەو دەکەن. بۆیە لە هەفتەی داهاتووەوە، پێویستە ئەو هەموو ئێوارەیەک لە ماڵەوە بێت، چونکە ڕەنگە هەموو شەوێک ماڵەکەم پڕ بێت لە میوان. بە دووقاتبوونی مووچەکەشم، هۆکارەکانی میوانداریمان لە بەردەست دەبێت. لەبەر ئەوەی میوانداریيەکە تەنها پێشکەشکردنی چای دەبێت، بۆیە خزمەتکار بەکرێ ئەگرین و سوودیان لێ وەرئەگرین بۆ ئەم کارە. بێگومان هیچ کێشەیەکیشمان نابێت. ئەو کاتە هەم لێرە و هەم لەوێ، لە هەردوولا هەمووان باسم دەکەن و پیاما هەڵدەدەن. زۆر لەمێژ بوو بەشوێن دەرفەتێکا ئەگەڕام، تا ناوم بکەوێتە سەر زاران. بەڵام سەرکەوتوو نەئەبووم، بە هۆی ئەوەی کارەکەم لە پلەیەکی وەهادا نەبوو و هیچ پلەیەکیشم نەبوو. بەڵام ئێستا کە تیمساحەکە منی بەئاسانی قووت داوە، هەست ئەکەم خەریکە ئەو ئاواتە دێرینەم بەدی دێت. ئیتر هەر وشەیەک لە زارم بێتە دەرەوە، هەمووان بە تامەزرۆییيەوە گوێی بۆ ڕادەگرن. هەر وتەیەکی من کە لە زارم بێتە دەرەوە، هەموویان دەخاتە گێژاوی بیرکردنەوەوە. وتەکانم ئەوترێنەوە و چاپ دەکرێت. فێریان دەکەم چ گەوهەرێکی

بەنرخم! سەرەنجام، ئەوانیش لەو ڕاستییە تێدەگەن، کە ئەم تیمساحە چ گەوهەرێکی بەنرخی لە سکدا هەڵگرتووە و ئەمان نرخیان نەزانیوە تا ئێستا...!

"هەندێک دەڵێن، '(ئەبووایە ئەم پیاوە وەزیری دەرەکی بووایە یان فەرمانڕەوای وڵاتێک بووایە.)' هەندێکی تریان دەڵێن، '(بەداخەوە کە ئەم پیاوە مەزنە فەرمانڕەواییی وڵاتێکی لە ئەستۆ نییە.)'

"ئەبێت من چیم لە گارنیرپاجیسشکی، یان هەرکەسێکی تر کەمتر بێت؟ ئەبێت خێزانەکەشم ببێت بە کەسێکی ناودار و ناسراو. من مێشکم، هەیە کە بیری پێ دەکەمەوە، ئەویش جوانی و دڵڕفێنییەکی بێوێنەی هەیە، کە سەرنجی هەمووانی پێ ڕادەکێشێت. دەستەیەک لە خەڵکی دەڵێن، '(ئەو جوانە، هەر لەبەر ئەمەشە ئەو خێزانی ئەوە.)' دەستەکەی تر بۆ ئەوانی تری ڕاست دەکەنەوە و دەڵێن '(ئەو جوانە، لەبەر ئەوە خێزانی ئەوە)'، هەر لەبەر ئەمەیە کە دەمەوێت هەرچی زووترە، ئیلینا ئیڤانۆڤنای خێزانم خۆی ئامادە بکات بۆ ئەم دۆخە نوێیەی بەڕێوەیە. ئەبێت سبەینێ بچێت ئەو ئینسایکلۆپیدیایە بکڕێت، کە ئاندری کراڤسکی نووسیویەتی، بەمەش ڕەنگە بتوانێت قسە لەسەر سەردێڕی هەر بابەتێک بکات. لە سەروو هەموو ئەمانەشەوە، با هەواڵە ڕامیارییەکانی

‘(پترزبۆرگ)’ بخوێنێتەوە و پاشان هەموو
ڕۆژنامەی ‘(پترزبۆرگ)’ بکات لەگەڵ ڕۆژنامەی ‘( ڤۆیس)’. پێم
ڕۆژێک بەراوردی بکات لەگەڵ ڕۆژنامەی ‘( ڤۆیس)’. پێم
وایە خاوەنی تیمساحەکەش قایل دەبێت بەوەی هەندێک
جار لەگەڵ تیمساحەکەیدا بمبات بۆ دیوەخانە ناوازەکەی
خێزانەکەم. من لەناو حەوزێکدا، لە ناوەڕاستی ژووری
میوانەکەدا شکۆمەندانە قسەگەلێکی دانایانە و پەندئامێز
لەگەڵ هەندێک نووکتەی خۆش بۆ ئەو خاتوونانە دەکەم،
کە لەوێ ئامادە دەبن. هەڵبەت ئەم قسانە بەیانییەکەی
ئامادەی دەکەم و لەوێ پێشکەشیان دەکەم. ئەبم بە
سەرگەرمییەکی زۆر باش بۆ ئەو خاتوونانەی لەوێ
ئامادە دەبن، سەرنجی هەموویان بەلای خۆمدا ڕائەکێشم،
بێ ئەوەی کارێکی وا بکەم، دڵیان لە هاوسەرەکانیان
کرمێ ببێت. بۆ هەموو ئەوانی تریش، ئەبم بە مرۆڤێک
- کە نموونەی ملکەچبوونە بەرامبەر بە چارەنووس و
ویستی خواوەند. هەروەها خێزانەکەشم ویژەزانێکی
ناوازەی لێ دروست ئەکەم. ئەبێت پێشی بخەم و باسی
کەسایەتییە ناوازەکەی لای هەمووان ئاشکرا بکەم. ئەو
وەک خێزانی من، ئەبێت خاوەنی باشترین و جوانترین
ئاکار بێت، ئەگەر ئەوان ڕاست بن لەوەی کە ئاندرێ
ئەلیکساندرۆڤیچ بە (ئالفرێد دی موسی) ڕووسیا ناو
ببەن، کەواتە خەڵکی ڕووسیاش مافی خۆیانە خێزانەکەم

بە (یڤیجینا تۆر*)ی ڕووسیا ناو ببەن.“

ئەبێت دانی پێدا بنێم، کە هەرچەندە ئیڤان ماتڤیتیچ خووی بەم قسە قۆڕ و بێسەرەوبەرانەوە گرتبوو، بەڵام وا دەر دەکەوت ئەم جارە تای لێ هاتبێت و وڕێنە بکات. هەر هەمان ئیڤان ماتڤیتیچی هەمیشەیی بوو، بەڵام بیست پلە بە پێچەوانەی جارانەوە تای لێ هاتبوو وڕێنەی دەکرد.

لێم پرسی:

”دۆستی من. ئایا ئۆمێدت بەوە هەیە ژیانێکی درێژ بژیت؟ ڕاستییەکەی بڵێ، ئایا هەر بەڕاستی تەندروستیت باشە؟ چۆن چۆنی نان دەخۆیت؟ چۆن چۆنی ئەخەویت؟ بە چ شێوەیەک هەناسە ئەدەیت؟ من هاوڕێتم، ئەبێت پەسەندت بێت، کە ئەم ڕووداوە ڕووداوێکی زۆر ناسروشتییە، لەگەڵ ئەوەشدا، کونجکاوییەکەی من زۆر سروشتییە.

بە دەنگێکی پڕ لە توانجەوە وەڵامی دامەوە:

---

* یڤیجینا تۆر: ناوێکی خوازراوی ئەدەبییە، کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆنتێسە ”سالیاس دو تورنمیر،“ کە ناوی (سوخوفو-کوبلین)ە سالانی (١٨١٥-١٨٩٢) ژیاوە. ئافرەتێکی وێژەزانی ڕووسییە، ڕۆماننووس و ڕەخنەگریش بووە.

"کونجکاوییەکی هیچوپووچ و بێمانا و هیچی تر! بەڵام وەڵامی پرسیارەکانت دەدەمەوە. ئەپرسیت کە چۆن لەناو سکی ئەم تیمساحەدا خۆم گونجاندووە؟ سەرەتا لە تیمساحەکەوە دەست پێ دەکەم، کە بۆتە هۆکارێکی زۆر باش بۆ سەرگەرمی من، چونکە ناوسکی بەتەواوی خاڵییە. ئەوەی بەڕاستی بۆتە جێگەی سەرسوورمانی من، ناوسکی ئەم تیمساحەیە، کە لە گوونییەکی لاستیکی گەورە دەچێت، ڕێک شێوەی لەو گوونییە لاستیکییانە دەچێت کە بازرگانەکانی شەقامی گۆرۆخۆڤی لە مۆرسکایا دەیفرۆشن. ئەگەر بە هەڵەیا نەچووبم، لە شەقامی فوزنیسنسکیش دەیفرۆشن. ئەگەر بەم شێوەیە نەبووایە، چۆن ئەمتوانی لەناو سکی ئەم تیمساحەدا جێ بەخۆم بگرم؟"

بە سەرسامییەکی زۆرەوە هاوارم کرد:

"مەگەر ڕێی تێ دەچێت ناوسکی ئەم تیمساحە بەتەواوی خاڵی بێت؟"

ئیڤان ماتڤیتیچ بە دەنگێکی بێپەروایانە و جەختلێکردنەوەوە وەڵامی دایەوە:

"بەتەواوی خاڵییە. بەپێی هەموو ئەگەرەکان، بەپێی یاساکانی سروشت دروست کراوە. تیمساح جگە لە کاژێرێکی گەورە و کۆمەڵە ددانێکی تیژ، لەگەڵ کلکێکی

درێژ، هیچی تر نییە. تەنها هەر ئەوەیە کە دەیڵێم. لەنێوان ئەم دوو بەشەشدا، واتە کەللە لەگەڵ کلک، بۆشاییەکی خاڵی هەیە، کە بە ماددەیەک ڕووپۆش کراوە، لە لاستیک ئەچێت لە لاستیکی (گوتا-پرکا). ڕەنگە گوتا-پرکای ڕاستیش بێت..."

لە تووڕەییدا قسەکەم پێ بڕی و وتم:

"ئەی پەراسوو، گەدە، ڕیخۆڵەکان، جگەر، دڵ. ئەی ئەمانە چی؟ ئایا هیچ یەکێک لەمانەی تێدا نییە؟"

"هیچی لێ نییە! بەدڵنیاییەوە هیچ یەکێک لەوانەی لێ نییە. لەوانەیە هەرگیز نەیبووبێت. هەموو ئەو قسانەی لەسەر جەستەی تیمساح دەکرێت، هەمووی قسەی بێبایەخ و هیچوپووچن، گەشتیارانی بێئیش ئەم جۆرە قسانە دەکەن.

"هەرچۆن یەکێک فوو دەکاتە دۆشەکڵەیەکی چەرمینی هەوایی، منیش ئا بەو شێوەیە لەناو سکی ئەم تیمساحەدا هەناسە ئەیەم. ناو سکی ئەم تیمساحە بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەکشێت. ڕاستیت بوێت، تۆ وەک هاوڕێیەکی خیزانەکەم - وەرە ناوەوە بۆ لام، ئەگەر هێندە بە خۆدا ئەپەرمویت و ڕۆحی قوربانیدانت بەپێی پێویست تێدایە - چونکە تەنانەت بە هاتنی تۆش، هێشتا جێگەیەکی خاڵی ئەمێنێتەوە. تەنانەت بیرم لەوەش کردۆتەوە، کە

ئەگەر ئەمە ببێت بە دواپەناگە، ڕەنگە بنێرم بە شوێن ئیلینا ئیڤانۆڤنای خێزانیشمدا. ئەم تیمساحە پووچەڵ و بۆشە، لەگەڵ یاساکانی زانستە سروشتییەکان زۆر ڕێک کەوتووە، بۆ نموونە، ئەگەر کەسێک بیەوێت تیمساحێکی نوێ دروست بکات، یەکسەر بە شێوەیەکی سروشتی ئەم پرسیارەی لەلا دروست دەبێت، ئایا ئەرکە سەرەکییەکانی تیمساحێک چییە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ڕوون و ئاشکرایە: کاری قووتدانی مرۆڤەکانە. بەڵام چۆن چۆنی کەسێک بە دروستکردنی تیمساحێک گەرەنتی ئەوە دەکات کە ئەو تیمساحەی دروستی کردووە، دەتوانێت خەڵکی قووت بدات؟ دیسانەوە وەڵامی ئەم پرسیارەش ڕوون و ئاشکرایە: ئەبێت ناوەوەی تیمساحەکە خاڵی بێت. زۆر لە مێژە لەلایەن فیزیکناسانەوە ئەوە سەلمێندراوە کە سروشت ڕقی لە خاڵیبوونە. لەم ڕووەوە ناوەوەی لاشەی تیمساح پێویستە خاڵی بێت، تیمساحیش بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی لە خاڵیبوون ڕزگار بکات، ئەوەیە کە هەرشتێک بێتە سەر ڕێی، بێ دواکەوتن و بەخێرایی هەڵی ئەلووشێ. ئەمە بەڵگەیەکی لۆژیکییە، کە ڕوونی دەکاتەوە بۆچی هەر تیمساحێک حەز بە قووتدانی مرۆڤ دەکات. جەستەی مرۆڤ بەم شێوەیە دروست نەکراوە؛ بۆ نموونە، هەتا مێشکی مرۆڤێک خاڵیتر بێت، ئەوە حەزێکی زۆر کەمتری دەبێت بۆ پڕکردنەوەی، ئەمەش

جگە لە جیاکارییەک لە یاسا گشتییەکان، هیچی دی نییە.
ئێستا هەموو شتێک بۆ من ڕوونە، وەک ڕووناکیی ڕۆژ.
هەموو ئەو زانیارییانەشی دەستم کەوتوون، هەمووی
لە ئەنجامی ئەزموون و سەرنجدانی خۆمەوە دەستم
کەوتوون، ئەگەر بڵێین لە ڕێگەی جێگیربوون لە هەناوی
سروشتا، بە گوێگرتن لە لێدانەکانی دڵی سروشت، هەموو
ئەو شتانەم بۆ ئاشکرا بوو. تەنانەت زانستی زمانناسیش
پشتگیری لە بیروباوەڕی من دەکات، سەبارەت بە وشەی
تیمساح (کرۆکۆدایل)، کە لە بنەڕەتدا ئەمە ناوێکی ئیتاڵییە
لە (corocodillo)، وەرگیراوە، کە بە مانای چلێسی دێت.
ئەم وشەیە لە سەردەمی فیرعەونەکانی میسریشدا بوونی
هەبووە و داڕێژراوە لە وشەی فەڕەنسی (Croquer) کە
بە واتای خواردن و قووتدان و مژینی خۆراک دێت. لە
بەرنامەمدایە تەواوی ئەم وشانە لە یەکەم وتارمدا لە
دیوەخانەکەی ئیلینا ئیڤانۆڤنا پێشکەش بکەم، ئەمە کاتێک،
کە بە حەوزی تیمساحەکەوە بۆ ئەوێم ئەبەن."

بەبێ ویستی خۆم هاوارم کرد:

"دۆستی من، تەنانەت ناتەوێت کەمێک دەرمانی ڕەوانیش بخۆیت؟"

پاشان بە کەمێک لە ترسەوە بە خۆمم وت: تای لێ هاتووە، تا، تایەکی زۆر خراپی لێ هاتووە!

بەدەنگێکی ئابڕووبەرانە وەڵامی دامەوە:

"قسەی قۆڕ مەکە! لەم بارودۆخەدا لەکوێوە دەرمانی ڕەوانی بخۆم؟ لام یەقین بوو کە تۆ باسی خواردنی دەرمانم لەگەڵ دەکەیت."

بەڵام هاوڕێکەم، ئەی چۆن... ئەی چۆن خواردن دەخۆیت؟ ئەمڕۆ نانت خوارد؟"

"نەخێر، نانم نەخواردووە، چونکە برسیم نییە، ڕەنگە هەرگیزیش خواردن نەخۆم. ئەم بارودۆخە تەواو سروشتییە بۆ من، چونکە بە پڕکردنی لاشەی تیمساحەکە، وام کردووە کە تیمساحەکەش هەرگیز هەست بە برسێتی نەکات. تیمساحەکە تا چەند ساڵێکی تر پێویستی بە خۆراک نابێت. لە ڕوویەکی تریشەوە، بە قووتدانی من، هەرچی شلەمەنییە گرنگەکانی لاشەیەتی، ئەیبەخشێت بە من. ئەمە ڕێک هاوشێوەی ئەو ژنە مەکربازانەیە، کە شەوانە وەک پارچەیەک گۆشتی کاڵ و خاو خۆیان دەخەنە بەردەست سەرجەم ئەو کەسانەی شەوانە لەگەڵیان ڕادەبوێرن، بەڵام دواتر، پاش خۆشۆردنی سەرلەبەیانی، تازە، جیڕ، خرپن و دڵفرێن دەبنەوە. بەم شێوەیە خواردن ئەبەخشم بە تیمساحەکە، منیش بەو پێیەی کە وەک خۆراک وام بۆ تیمساحەکە و خواردنم پێ بەخشیوە، لە بەرامبەردا خواردنی لێ وەردەگرمەوە، ئا بەم شێوەیە یەکتر تێر

دەکەین. بەڵام لەبەر ئەوەی ئاسان نییە تەنانەت بۆ تیمساحێکیش تا مرۆیەکی وەک من هەرس بکات، هەر بۆیە و بێگومان دەبێت هەست بە قورساییەک بکات لە گەدەیدا. هەرچەندە ئەو هیچ ئەندامیکی هەرسکردنیشی نییە تا من هەرس بکات، بۆیە تووشی ئازار دەبێت. منیش بۆ ئەوەی ئەو گیاندارە ئازار نەچێژێت، زۆر ئەمدیو و ئەودیو بە خۆم ناکەم، هەرچەندە ئەتوانم بەئاسانی ئەمدیو و ئەودیو بکەم، بەڵام لەبەر هەستی مرۆڤایەتیم، ئەو کارە ناکەم. ئەمە تەنیا کێشەیەکە، کە لە ئێستادا بەدەستییەوە ئەناڵێنم.

"تیمۆفی سمیۆنیچ بە مانا مەجازییەکەی ڕاست دەکات کە دەڵێت، من وەک کۆتەرەدارێک ڕاکشاوم. بەڵام ئەیسەلمێنم، ئەگەرچی وەک کۆتەرەدارێکیش ڕاکشابم - نا، بە هەڵە وتم، تەنها ڕاکشاو وەک کۆتەرەدارێک - مرۆڤ ئەتوانێت هەر بەم شێوەیە هەستی شۆڕشگێڕی لە سەرجەم مرۆڤەکاندا بەدی بهێنێت. هەموو بیرۆکە ناوازەکان و وتاری ناو ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکانی ئێمە، بە ئاشکرا دیارە کە جێدەستی کەسانێکە، کە وەک کۆتەرەدار ڕاکشاون؛ هەر لەبەر ئەمەیە کە بەم جۆرانە دەڵێن دابڕاو لە ڕاستییەکانی ژیان - بەڵام چ گرنگییەکی هەیە ئەو قسانەی بەوان دەوترێت! هەرچۆنێک بێت، من سیستەمێکی تایبەت و تەواو بۆ خۆم دروست ئەکەم و

ڕەنگە باوەڕ نەکەیت ئەم کارە تا چ ڕادەیەک ئاسانە! هەر هێندەت دژوارە، تا دەخزێیتە سووچێکەوە، یاخود بخزێیتە ناو سکی تیمساحێکەوە، ئەوکات چاوەکانی خۆت دادەخەیت و بەخێرایی داهێنان بۆ هەزار ساڵی مرۆڤایەتی دەکەیت. هەر ئەمڕۆ لای دوانیوەڕۆکەی، کە تۆ ئێرەت بەجێ هێشت، بێ وەستان دەستبەکار بووم و سێ سیستەمی تایبەت بە خۆمم داهێنا و ئێستاش خەریکم چوارهەمیش ئامادە دەکەم. ئەوە ڕاستییە، کە کەسێک بۆ دروستکردنی بیردۆزێکی نوێ، دەبێت هەرشتێک کە پێشتر بوونی هەبووە، هەمووی وەلا بنێت، ڕەنگە ئەم کارە لە جیهانی دەرەوەدا هێندە کارێکی ئاسان نەبێت، بەڵام لەناو سکی تیمساحدا، کاری وەلانان کارێکی زۆر ئاسانە؛ جگە لەوەش، تێڕامان لەناو سکی تیمساحدا، وا دەکات هەموو شتەکان ڕوونتر و ئاشکراتر دەر کەون...

"هەڵبەت چەند کێشەیەکی بچووکم هەیە: ئێرە تۆزێک شێدارە و وەک ئەوەی بە جۆرێک لە لیتە داپۆشرابێت وایە؛ لەگەڵ ئەوەشدا، بۆنێکی ناخۆشیشی وەک بۆنی لاستیکی هندی لێ دێت، بۆنەکەی کتومت وەک بۆنی لاستیکە گالشە ڕووسییە کۆنەکانی خۆم وایە. کێشەی من تەنها ئەم شتانەیە، ئەگینا هیچ کێشەیەکی دیکەم نیە..."

قسەکانیم بڕی و وتم:

"ئیڤان ماتڤیتیچ، هەموو ئەم شتانەی دەیانڵێیت وەک پەرجوویەک وەهایە، کە هێندە ئاسان نییە باوەڕی پێ بهێنرێت. ئایا ئەتوانیت... هەرگیز ئەتوانیت جارێکی تر نان بخۆیت؟"

"بۆچی مێشکی خۆت بەم شتە قۆڕ و بێمانایانەوە جەنجاڵ کردووە؟ تۆ کەسێکی، زۆر کەم بیر دەکەیتەوە، بوونەوەرێکی زۆر گەمژەیت! من باسی بیرۆکەگەلێکی مەزنت بۆ دەکەم کەچی جەنابیشت!... لەوە تێبگە کە هەموو ئەم بیرۆکە مەزنانەی بۆم هاتوون، هەرچی ئەم تاریکییەی تێی کەوتووم، ڕووناک کردۆتەوە. ئەم پیاوە ئەڵمانییە جوانسروشتە، لەگەڵ خێزانە میهرەبانەکەی (دایە)، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون کە گرنگی بدەن بە بابەتی چۆنێتی خواردنپێدانی من، ئەویش لە ڕێگەی لوولەیەکی کانزاییی چەماوەوە، کە لە لوولەی فیکەلێدان دەچێت، هەموو بەیانییەک ئەو لوولەیە ئەخەنە ناو شەویلگەی تیمساحەکەوە، تا لە ڕێگەیەوە، قاوە یان تشریبم بدەنێ. ئێستا ئەم لوولەیە وەک هاوسێی منی لێ هاتووە و لە نزیک من کەناری گرتووە و وا دەر دەکەوێت لوولەیەکی زۆر گرانبەها بێت. هیوادارم بە

لایەنی کەمەوە نزیکەی هەزار سالێک بژیم. ئەگەر ڕاست بێت، کە دەڵێن تیمساح بۆ ماوەیەکی درێژ دەژی. کارێکی باش دەکەیت ئەگەر سبەینێ تەماشای هەندێک مێژووی سروشتیم بۆ بکەیت، ئاگادارم بکەیتەوە و بزانیت شتی وا ڕاستی هەیە، کە بڵێت تیمساح هەزار ساڵ تەمەن ئەکات؟ بزانە ڕاستە یان نا. چونکە لەوانەیە ئەم تیمساحەم لەگەڵ دەعبایەکی هەڵکۆڵەری تر لێ تێک چووبێت. تەنها یەک شت هەراسانم ئەکات؛ ئەویش ئەوەیە من جلم لەبەردایە و پۆتینم لەپێدایە، لەبەر ئەمە، تیمساحەکە ناتوانێت بەئاسانی هەرسم بکات، لەگەڵ ئەوەی خۆم زیندووم، بەوپەڕی توانامەوە ڕێگری لە دۆخی هەرسکردن دەگرم، بۆ ئەوەی تۆ لەمە تێبگەیت، ئەوەیە کە من نامەوێت بگۆڕێم بە شتێک، کە خوازیاری بوون - بەو - شتە نیم. هەروەک تەواوی خۆراکەکانی تر، دەبن بەو شتەی دەبێت ببن، ئەمە وام لێ دەکات زۆر قێز بکەمەوە. بەڵام لە شتێک زۆر ئەترسم: ترسەکەشم لەوەیە، ئەو پاڵتۆیەی لەبەرمدایە، لە بێبەختیی من دروستکراوی ڕووسییە، ڕەنگە بەرگەی مانەوە نەگرێت و لە ماوەی هەزار ساڵدا، کە لەناو سکی ئەم تیمساحەدام، بڕزێت و بێ جلوبەرگ بمێنمەوە. ئیتر بەم شێوەیە هیچ شتێک نامێنێتەوە، تا لە هەرسکردن بمپارێزێت، ڕەنگە ئەو کاتە تیمساحەکە بتوانێت هەرسم بکات. هەڵبەت لە ڕۆژدا، هەرچۆنێک

بێت، ڕێگە نادەم هەرسم بکات، بەڵام لە شەودا و کاتی نوستن، ڕەنگە بچمە خەوێکی قووڵەوە و بەم شێوەیە ڕێگە بدەم هەرسم بکات. ڕەنگە ئەو کاتە ڕووبەڕووی چارەنووسێکی غەمگینی وەک، پەتاتەیەک، پارچەکێکێک، یان وەک گۆشتی گوێرەکەیەک ببمەوە.

"کاتێک بیر لەمە دەکەمەوە و ئەیهێنمە بەرچاوی خۆم، زۆر تووڕەم دەکات. بابەتی لەناوچوونی پاڵتۆ ڕووسییەکەی من، دەتوانرێت بکرێت بە بەڵگەیەکی باش بۆ ئەوەی سەرلەنوێ پێداچوونەوە بە ڕەوشی گومرگی هاوردەکردنی جلوبەرگی ئینگلیزیدا بکرێتەوە. بەو هۆکارەی جلوبەرگی ئینگلیزی قایمترن و بۆ ماوەیەکی زیاتر و درێژتر، لە جلوبەرگی ڕووسی بەرگە دەگرێت و دەمێنێتەوە. بۆ ئەوەی ئەگەر هات و تیمساحەکە کەسێکی تری قوت دا، جلەکانی کەسەکە زیاتر بەرگە بگرێت. هەر لەبەر ئەم هۆکارەش دەکرێت باجی گومرگی لەسەر کاڵای ئینگلیزی زیاد بکرێت و ئەمەش دەبێتە داهاتێکی باش بۆ وڵاتەکەمان. لە یەکەم دەرفەت کە بۆم هەڵکەوێت، ئەم بابەتە لای هەندێک سیاسەتمەدار دەخەمە بەر باسوخواس، وە لە هەمان کاتا ئەم بابەتە بۆ نووسەرە سیاسییەکانی ڕۆژنامەی ڕۆژانەی پترسبۆرگ باس دەکەم. ڕێیان بدەن با لە دەرەوەش بە چاپی بگەیەنن. دڵنیام ئەمە تاقە بیرۆکەیەک نابێت، کە لە منەوە بەدەستی دەهێنن.

لە بەرچاومە کە هەموو بەیانییەک، کۆمەڵێکی ڕێکخراو لە ڕۆژنامەوانان قایل دەبن بەوەی بیستوپێنج کوپیک بدەن، تەنها بۆ ئەوەی سەرنج و تێڕوانینی من وەربگرن لەسەر دواسەردێڕی ئەو تەلەگرافانەی ڕۆژی پێشتر پێم گەیشتوون لەسەر خودی ئەو بابەتانەی کە لەبارەی بیرۆکەکانی من لە ڕۆژنامەکانیان بڵاویان کردۆتەوە. بەکورتی، داهاتوو بەوپەڕی ڕووناکییەوە دەرگاکانی خۆی بە ڕووی مندا والا کردووە."

لەژێر لێوەوە بە خۆمم دەوت: تای لێ هاتووە. تای لێ هاتووە! بەڵام هەر بۆ ئەوەی بزانم بە شێوەیەکی تەواو ڕوانگەی چۆنە، پرسیم:

"دۆستی من، ئەی سەبارەت بە ئازادیت چی دەڵێیت؟ تۆ لە زیندانەوە وتاربێژی دەکەیت، لە کاتێکا هەرکەسێک مافی ئەوەی هەیە چێژ لە خۆشیی ئازادیی خۆی ببینێت! ئایا ئازادی باشترین بەخشش نییە بۆ مرۆڤ؟"

"تۆ مرۆیەکی گەمژەیت، تەنها دڕندەکان مەیلیان لە ئازادییە، بەڵام دانایانی ڕاستەقینە پەیڕەو هەڵدەبژێرن بەسەر ئازادیدا و پەیڕەویان خۆش دەوێت، هەڵبەت ئەگەر پەیڕەوێک بوونی هەبێت..."

"ئیڤان ماتڤیتیچ، لێت ئەپاڕێمەوە واز لەم قسانە بهێنە!"

ئیڤان ماتڤیتیچ لەبەر ئەوەی قسەکانیم پێ بڕیبوو،

زۆر تـووڕە بـوو، بـە دەنگی بـەرز هـاواری کـرد:

"زارت ببەستە و باش گوێ ڕادێرە! من هەرگیز هێندەی ئێستا هەستم بە بەهێزی و گورجوگۆڵیی خۆم نەکردووە. مـن لـەم پەناگەیـەی خـۆم، تەنهـا یـەک شـت ئەمتۆقێنێت، ئەویش ئـەو ڕەخنـە ئەدەبییانـەی کـە مانگانـە دەگیرێـت، هەروەهـا واتەواتـی هەندێـک لـە ڕۆژنامە جنێوفرۆشـەکانیش. ئەترسـم خوێنـەرە گەمژەکانـی ئـەو جـۆرە ڕۆژنامـە و گۆڤارانـە، کـە خەڵکانێکی بێئەقڵ و ئیرەییبەر و (نیهیلیزم*) ن، بمکـەن بـە گاڵتەجاڕی خۆیـان.

"بـەڵام سـەرەڕای هەمـوو ئەمانـەش، مـن بـە کاری خـۆم هەڵدەسـتم. بەبێئارامـی چاوەڕوانـی ئـەو دادوەرییـە ئەبـم، کـە ڕوانگـەی گشـتی لەسـەرم دەیدەن، بەتایبەتـی ڕای ڕۆژنامەکانـی سـبەینێ. پێویسـتە لەسـەرت، سـبەینێ ناوەڕۆکی ئەو وتارانەم بۆ بخوێنیتەوە، کە لە ڕۆژنامەکاندا بـڵاو دەکرێتـەوە!"

"زۆرباشـە، سبەینێ یـەک باوەش ڕۆژنامـە لەگەڵ خۆم دەهێنم!"

---

* نیهیلیـزم: (هیچگـەرا nihilism) فەلسـەفەیەکە دەڵێت هیـچ شـتێک بوونی نییە و نازانرێ و ناگەینرێ بە کەسی تر. فەلسـەفەیەکە بڕوای نییە بە هیـچ جۆرە فەلسـەفە و بیروباوەڕێکی ئاکارباشـی و ئایینـی و کۆمەڵایەتی و دژیان دەوەستێ. بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕی خوێناوی بوو لـەدوای سـەدەی نۆزدەهەم و سـەرەتاکانی سـەدەی بیستەم، لـە ڕووسیا بوونـی هەبـوو. س. ف. ئازادی

"سبەینێ زۆر زوو دەبێت بۆ ئەو کارە. چونکە نزیکەی چوار ڕۆژی تەواوی پێ دەچێت، تا ڕۆژنامەکان ئەم بەسەرهاتە بڵاو بکەنەوە. بەڵام لەمڕۆوە، هەر ئێوارەیەک کە هاتیت بۆ ئێرە، لە دەرگای پشتەوە وەرە، چونکە ئەمەوێت تۆ وەک سکرتێری خۆم دامەزرێنم. ئیشی تۆ ئەوە دەبێت ڕۆژنامە و گۆڤارەکانم بۆ بخوێنیتەوە، پاشان منیش بیرۆکە و ئەندێشەکانی خۆمت بۆ ڕوون دەکەمەوە و ئەرکیشت پێ دەسپێرم، بە شێوەیەکی گشتی، زۆر وریای تەلەگرافە بیانییەکان بیت، بیرت نەچێت هەموو ڕۆژێک هەواڵی تەلەگرافی ڕۆژنامە ئەوروپییەکان لەگەڵ خۆت بهێنیت. زۆرباشە، چیتر بۆ ئەمڕۆ بەسە. ڕەنگە ئێستا خەوت بێت. بۆماڵەوە بگەڕێرەوە و بیریش لەو بابەتی ڕەخنەییەی ناو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان مەکەرەوە، کە ئێستا بۆم باس کردیت، وا تێنەگەیت لەو ڕەخنانە دەترسم، چونکە خودی بارودۆخی ڕەخنەگرتنیش لە ئێستادا خۆی لە خۆیدا جێگەی ڕەخنەیە! مرۆڤ دەبێت دانا و چاکەکار بێت، چونکە تەنها بەم ڕێگەیە بە پلەی کەماڵ دەگات.

"ئەگەر نەبم بە سوقرات، ئەوە ئەبم بە دیۆجین، یان هەردووکیان پێکەوە دەبن بەو ڕۆڵەی لە ئاییندەدا دەمبێت لەناو مرۆڤایەتیدا."

بەم شێوەیە ئیڤان ماتڤیتیچ بەپەلەپەل و خۆنازینەوە و بەوپەڕی لووتبەرزییەوە لە بەردەمما باسی خۆی دەکرد. بە خانمێکی تاڵیهاتووی لاواز دەچوو، کە ئێمە پەندێکمان هەیە دەڵێت "(خانمان ناتوانن هیچ نهێنییەک بپارێزن)." هەرچی کە ئەو بۆی باس کردم لەسەر تیمساحەکە، تووشی سەرسامییەکی زۆری کردم. چۆن ڕێی تێ دەچێت ناو سکی تیمساحەکە بەتەواوی خاڵی بێت؟ ئامادەم گرێو بکەم، کە نەیئەویست غروری خۆی لەژێر پێ بنێت، یان هەر مەبەستی بوو بە ئانقەست من بچەوسێنێتەوە و یاری بە ئەقڵم بکات.

ئەمزانی ئەو نەخۆشە و ناکرێت قسەی مرۆڤی نەخۆشیش بە هەند وەربگیرێت، پێویستە بارودۆخی نەخۆشیش لە بەرچاو بگیرێت. بەڵام بێپەردە و بەئاشکرا دانی پێدا دەنێم، کە هەرگیز نەمتوانیوە ئارامی خۆم لە بەرامبەر ئیڤان ماتڤیتیچدا لەدەست نەدەم. لە تەواوی ژیانما - هەر لە منداڵییەوە تا گەورە بوونمان بەیەکەوە - هەوڵم داوە خۆم لە ئامۆژگارییە بێبنەما و سووکەکانی قوتار بکەم، بەڵام نەمەتوانی! هەزار جار هەوڵم دابوو کۆتایی بە پەیوەندیی هاوڕێیەتیمان بهێنم، بەڵام هەموو جارێک شتێک دروست ئەبوو و سەرلەنوێ لە یەکی

نزیک ئەکردینەوە. ڕەنگە هۆکەی ئەوە بووبێت، کە هەمیشە هەوڵم داوە شتێکی بۆ بسەلمێنم، یاخود هۆکەی ئەوە بووبێت، بەڕاستی پێم خۆش بووە لە دەرفەتێکا تۆڵەی هەموو شتێکی لێ بکەمەوە. هاوڕێیەتی نێوان ئەم دووانەمان پەیوەندییەکی زۆر سەیر بوو!

ئەتوانم بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە بڵێم، لە سەدا نەوەدی ئەو هاوڕێیەتییەی من بەرامبەر بە ئەو، لە کینە زیاتر چیدی نەبوو. بەڵام هەرچۆنێک بێت، ئەمجارەیان بە هەستێکی زۆر دۆستانە و ڕاستگۆیانە لە یەک جیا بووینەوە.

کابرای ئەڵمانی، کە بەوردی گوێی لە وردودرشتی قسەکانمان گرتبوو، لە کاتی ڕۆیشتنەدەرەوەم لەو شوێنە، بە چرپە پێی وتم:

"هاوڕێکەتان کەسێکی زۆر ژیرە!"

"بەڕاست، ئەگەر کەسێک بیەوێت ئەم تیمساحەی ئێوە بکڕێت، بە چەندێک دەیفرۆشن؟"

ئیڤان ماتڤیتیچ، کە وا دیار بوو گوێبیستی پرسیارەکە بووبێت، شەیدایانە چاوەڕوانی وەڵامی کابرای ئەڵمانی دەکرد. بەڕوونی دیار بوو ئەو پێی خۆش نەبوو کابرای ئەڵمانی تیمساحەکەی هەرزانفرۆش بکات. کابرای ئەڵمانیش کە وا دەر دەکەوت لە سەرەتادا باش گوێبیستی

پێشنیارەکەم نەبووبێت، بۆیە بەوپەڕی تووڕەبوونەوە سوور هەڵگەڕا و وەک قرژاڵی کوڵاوی لێ هات، هاواری کرد:

"ناوێرێت کەس بکڕێت تیمساحی من! من تیماسحەکە نامەوێت بفرۆشم! یەک ملوێن (تالر*)یش بدەن، نافرۆشم تیمساحەکە. من ئەمڕۆ سەد و سی تالرم لە مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی خەڵکیدا وەرگرتووە. سبەینێ وەردەگرم دە هەزار تالر دەبێت. نەخێر، پاشان سەد هەزار دەبێت وەرگرم هەموو ڕۆژێک. من نافرۆشم ئەو."

ئاشکرا بوو کە ئیڤان ماتڤیتیچ لە خۆشیا خەنی بوو. هەوڵم دا بەسەر خۆمدا زاڵ بم - چونکە پێم وا بوو ئەرکێکی هاوڕێیانەم لەسەر شانە و ئەبێت ئارامی خۆم لەدەست نەدەم. بە دەنگێکی سارد و ئەقڵانەوە بە ئەڵمانییە شێتەکەم نیشان دا، کە ژماردنەکەی تەواو هەڵە بووە، وتم: ئەگەر بەو پێیە بێت کە تۆ دەیڵێیت هەموو ڕۆژێک سەد هەزارت دەست بکەوێت، کەواتە لە ماوەی چوار ڕۆژدا هەموو دانیشتووانی پترسبۆرگ بۆ بینینی تیمساحەکەت دێن، لەبەر ئەوەشی کە ژیان و مردن لە دەستی خوداوەندایە، بۆی هەیە لە هەرساتێکدا بێت

---

* تالر: سکەی زیویی ئەڵمانی بووە، کە لە سەدەکانی پازدە تا نۆزدەی زایینی لە ئەڵمانیا مامەڵەی پێوە کراوە، وشەی دۆلاریش لەم وشەیەوە وەرگیراوە.

تیمساحەکەتان بتەقێت، یاخود ئیڤان ماتڤیتیچ نەخۆش،
بکەوێت و بمرێت و هەتا دوایی.

کابرای ئەڵمانی، کە وا دەر دەکەوت قسەکانم کاری تێ کردبێت، کەوتە گێژاوی بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، دوای ئەوەی بیری کردەوە، وتی:

"لە دەرمانخانە وەردەگرم قەترە بۆی، بەم شێوەیە دەکەم ڕزگار هاوڕێی ئێوە ئیتر نامرێت ئەو."

"قەترە، دەرمانێکی خراپ نییە، بەڵام لەیادتان نەچێت، ڕەنگە ئەم بابەتە بکێشرێتە دادگا. ڕەنگە خێزانی ئیڤان ماتڤیتیچ بەپێی یاسا داوای دەرهێنانی مێردەکەی بکات لەناو سکی ئەم تیمساحەدا. تۆ حەز دەکەیت دەوڵەمەند بیت، بەڵام ئایا حەز دەکەیت مووچەی بێوەژنانە ببڕیتەوە بۆ ئیلینا ئیڤانۆڤنا؟"

کابرای ئەڵمانی بە دەموچاوێکی مۆنەوە و بە دەنگێک کە پڕ بوو لە توونودتیژی، وتی:

"نەخێر، نیمە خواستێک لەم جۆرە!"

دایەش بە دەغەزدارییەوە دەنگی خۆی خستە پاڵ مێردەکەی و وتی:

"نەخێر، نیمانە خواستێک لەم جۆرە!"

"زۆر باشە، کەواتە باشتر نییە هەر ئێستا نرخێک

بڵێن، کە لەگەڵ ڕاستیدا بگونجێت و پەسەندی بکەن، پێش ئەوەی کارەکە بکەوێتە دەستی چارەنووس! ئەبێت ئەوەشتان پێ ڕابگەیەنم، کە حەزی زانین وای لێ کردم ئەم پرسیارە بکەم."

کابرای ئەڵمانی پەلی دایەی گرت و ڕای کێشایە سووچێکی گەلەرییەکەوە، بۆ ئەوەی ڕاوێژی پێ بکات، ڕێک لە نزیک قەفەسی ناشرینترین و زەبەلاحترین مەیموونا وەستابوون.

ئیڤان ماتڤیتیچ وتی:

"زۆر باشە، دەبینیت!"

لەلای خۆمەوە، لەو ساتەدا لە خۆشییا خەریک بوو لە پێستی خۆم ئەهاتمە دەرەوە. چونکە، یەکەم، گورزێکی بەهێزم لە کابرای ئەڵمانی وەشاند، دووەم، دایەشم لە شوێنی خۆیدا کپ کرد، سێیەم و لە کۆتاییشدا غرورە بێئەندازەکەی ئیڤان ماتڤیتیچیشم شکاند. بەڵام، هەموو ئەو دڵخۆشییەم بە وەڵامێکی کابرای ئەڵمانی چاوچنۆک و زۆرزان لەناو چوو.

کابرای ئەڵمانی دوای ڕاوێژکردنی بە ژنەکەی، داخوازیی ئەوەی کرد، لە بەرامبەر تیمساحەکەی، بڕی پەنجا هەزار ڕۆبڵ بە شێوەی قەواڵەی قەرزی ڕووسی و لەگەڵ چەند بلیتێکی یانسیب، کە پارەیەکی زۆری پێ

ببرێتەوە، هەروەها خانوویەکی لە - خشت - دروستکراو لە شەقامی گرۆهۆڤی، هاوپێچ لەگەڵ دوکانێکی دەرمانفرۆشتن، لەگەڵ وەرگرتنی پلەی عەقید لە سوپای ڕووسیادا.

ئیڤان ماتڤیتیچ، بە دەنگێک کە هەستی سەرکەوتنی تێدا بەدی دەکرا، هاواری لێ کردم و وتی:

"ببینیت! چیم پێ وتیت! جگە لەم خواستە بێمانایەی کۆتایی، پلەی عەقید لە سوپای ڕووسیا، کابرای ئەڵمانی داوای چی کردووە، مافی خۆیەتی، چونکە بەتەواوی بۆی ڕوون بۆتەوە، کە ئەم جانەوەرەی نمایشتی دەکات، چەند بەنرخە. بنەماکانی ئابووری لەپێش هەموو شتێکەوەیە!"

بەوپەڕی توورەییەوە هاوارم کرد بەسەر کابرای ئەڵمانیدا!

"بۆچی ئەتەوێت ببیت بە عەقید؟ چ داستانێکت تۆمار کردووە؟ چ خزمەتێکت کردووە؟ یان چ شانازییەکت پێ بەخشراوە لەلایەن سوپای وڵاتەکەمانەوە؟ بەڕاستی تۆ شێت بوویت، کابرا!"

کابرای ئەڵمانی وا دیار بوو ئەم قسەی کۆتاییم دەماری گرتبێت بەوپەڕی جاڕزییەوە وتی:

"شێت! نەخێر، کەسێک زۆریش وشیارم. بەڵام زۆر تۆ گەمژەیت! پلەی عەقیدی شایستەی منە بۆ ئەوەی

تیمساحێک نمایش دەکەم لە ناویشیدا دانیشتووە ڕاویژکارێکی زیندوو! کەسێکی ڕووسی دەتوانێت، بەڵام تیمساحێک نەتوانێت ڕاویژکارێک دەژی لەناویدا، ببێت بە عەقید! من ئەوپەڕی ژیرم کابرایەک زۆریش، عەقید مەراقمە کە ببم!"

لە کاتێکدا کە لە تووڕەییدا لەرزم پێ کەوتبوو، هاوارم کرد:

"زۆر باشە. کەواتە بەنیازی دیدار، ئیڤان ماتڤیتیچ!

بەپەلە لە ژووری تیمساحەکە ڕام کردە دەرەوە. ئەگەر بهاتایە و یەک خولەکی تر لەو شوێنەدا بمامایەتەوە، بەدڵنیاییەوە نەمەتوانی زاڵ بم بەسەر خۆما و ئەوەی نەدەبوو ڕوو بدات، ڕووی دەدا. چونکە هیچ وەڵامێکی لۆژیکیم دەست نەدەکەوت. چاوچنۆکیی ئەو دوو مرۆڤە کەللەڕەقە و داخوازییەکانیان، کاری کردەنی نەبوو. هەوای ساردی دەرەوە، تۆزێک هۆشی بەبەر هێنامەوە و بە شێوەیەک لە شێوەکان تووڕەییەکەی تۆزێک دامرکاندمەوە. لە کۆتاییدا، دوای ئەوەی بە هەرچی هێزی خۆمەوە پازدە تفم بەلای ڕاست و چەپی خۆمدا کرد، گالیسکەیەکم گرت و بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە. جلەکانم لەبەری خۆم داکەند و خۆم کرد بەژێر جێگەکەمەوە. ئەوەی لە هەموو شتەکانی تر زیاتر جاڕزی کردبووم،

ئەوە بوو کە دەبوو ببم بە سکرتێری ئیڤان ماتڤیتیچ. ئێستا ئەبێت هەموو ئێوارەیەک لە جاڕزیدا بمرم، ئەمە هەر لەبەر ئەوەی ناماقوڵیم کرد و وتم هەڵدەستم بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی هاوڕێیەکی ڕاستەقینە! ئامادە بووم لەسەر ئەم کارەم لە خۆم بدەم. لە ڕاستیدا، ئەوکارەشم کرد. دوای ئەوەی مۆمەکەم کوژاندەوە، جلەخەوەکانم لەبەر کردن ،چەندین جار مستەکۆڵەم کوتییە سەرم و چەندین شوێنی جۆراوجۆری جەستەم. بەم شێوەیە هەرچۆنێک بێت، تۆزێک ژیانم تێ گەڕایەوە، لە کۆتاییشدا بە هۆی ئەوەی گەلێک ماندوو بووم، لە خەوێکی تەواو قووڵ ڕۆچووم. بەدرێژاییی ئەو شەوە لە مەیموون زیاتر خەونم بە هیچی ترەوە نەدەبینی، بەڵام نزیکی سپێدە، خەونم بە ئیلینا ئیڤانۆڤناوە بینی.

(٤)

سەبارەت بەو مەیموونانەی کە لە خەوەکەمدا بینیم، وا گومان دەبەم بە هۆی ئەوەوە بووبێت، کە هەموویان لە لەلای ئەڵمانییەکە لەناو قەفەسدا زیندانی کرابن؛ بەڵام ئەوەی ئیلینا ئیڤانۆڤنا چیرۆکێکی جیاوازتر بوو.

ڕەنگە یەکسەر و بێ دواکەوتن بڵێم، کە من ئەم خانمەم خۆش دەویست. بەڵام لە دەربڕینی هەستی خۆم، کەمێک پەلەم کرد، ئەویش چ پەلەکردنێک، پەلەکردنێکی زۆر نابەجێ. وەک چۆن باوکێک کچەکەی خۆی خۆش دەوێت، منیش وەک باوکێک ئەوم خۆش دەویست، نە زۆرتر و نە کەمتر. ئەم داوەرییەی من سەبارەت بەم پەیوەندییە، لەبەر ئەوە بوو کە زۆر جار هەستم دەکرد مەیلێکی سەیرم هەبوو بۆ ماچکردنی سەرە بچووکەکەی، یان کولمە ئاڵەکانی، کە نەمدەتوانی بەر بەو مەیلە بگرم. بەڵام هەرگیز ئەم مەیلەم بەدی نەهێنابوو. بەڵام ئەبێت دانی پێدا بنێم، ئەگەر دەرفەتی ماچکردنی لێوەکانیم بۆ

هەڵبکەوتایە، ئەوە هەرگیز خۆمم لێ لا نەئەدا، نەک هەر بەتەنیا لێوەکانی، بەڵکو دانە نازدارەکانیشی، کە وەک دوو ڕشتەی مرواری وردیلە و جوان بوون... بەتایبەت ئەو کاتانە زۆر جوانتر دەر دەکەوتن، کە پێدەکەنی. ئەو زۆر جار سەرئاسا پێدەکەنی. ئیڤان ماتڤیتیچ لە کاتە خۆشەکانی ژیانیدا وا خۆی گرتبوو، کە ئیلینا ئیڤانۆڤنای بە (خۆشەویستە بەرزەفڕ)ەکەی بانگ بکات - ئەمە نازناوێک بوو، لێوڕێژ بوو لە ڕاستگۆیی و شادی. ئەو نازناوەی زۆر لێ دەهات. ئەگەر بتوانم بڵێم، ئیلینا ئیڤانۆڤنا هەر بەڕاستی ئەتوت نوقڵە، هێندە خوێنشیرین و لەبەردڵان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، نەمەتوانی لەوە تێبگەم چ شتێک وای لە ئیڤان ماتڤیتیچ کردبوو، وا خەیاڵ بکات خێزانەکەی لە یڤیجینا تۆری ڕووسی دەچێت؟

بە هەرحاڵ، خەونەکەی من، مەیموونەکانی لێ دەر چێت، کاریگەرییەکی لەڕادەبەدەر خۆشی لەسەر بەجێ هێشتم، بووە هۆکاری ئەوەی هەرچی ئەوەی دوێنێ ڕووی دا لەبیرم بچێتەوە، بەتایبەت کاتێک کوپەچایی بەیانیانی خۆمم نۆش کرد. پێم باش بوو پێش ئەوەی بڕۆم بۆ کارەکەم، سەرێک لە ئیلینا ئیڤانۆڤنا بدەم. لە ڕاستیدا وەک دۆستێکی خێزانەکە، ئەبووایە ئەم کارەم بکردایە.

لەو ژووەرە بچووکەی لە دەرەوەی ژووری نووستنەکە بوو - پێیان دەوت ژووری میوانی بچووک، بەم شێوەیە ژووری میوانەکەیان لە ڕاستیدا هێندە گەورە نەبوو، بگرە زۆریش بچووک بوو. ئیلینا ئیڤانۆڤنا بە جلی ژێرەوە و نیمچەڕووت، لەسەر چەرپایەکی جوان، نزیک مێزی نانخواردنی بەیانیان لێی دانیشتبوو و قاوەی دەخواردەوە، لەولای کوپە بچووکەکەشییەوە، هەندێک بسکیتی دانابوو، کە لە قاوەکەی هەڵدەکێشا و بە قاوەکەوە دەیخوارد. بەڕاستی جوانییەکەی مرۆڤی حەیران دەکرد، تەواوی بیر و هەستی داگیر کردبووم. هێشتا بەتەواوی داڵغەکەم بەری نەدابووم، منی بینی و بە زەردەخەنەیەکەوە، کە وا دیار بوو هێشتا لە داڵغەلێداندا بێت، سڵاوی لێ کردم و وتی:

"ئاه ئەوە تۆیت، ساختەچی! وەرە دانیشە، پیاوی ساویلکە! وەرە قاوەیەکم لەگەڵ بخۆرەوە. زۆر باشە، پێم بڵێ بزانم دوێنێ چیت کرد؟ ئایا چوویت بۆ ئاهەنگی دەموچاوداپۆشینەکە؟"

"بۆ مەگەر تۆ چوویت؟ تۆ ئەزانیت من مەیلی چوون بۆ ئەو جۆرە شوێنانەم نییە. بەتایبەت دوێنێش، کە سەردانی ئەو بەندییە بەدبەختەم کرد..."

ئاهێکی قووڵم هەڵکێشا، هەروەها لە کاتێکدا کە

کوپی قاوەکەم بە دەستەوە بوو، چوومە دۆخێکی زۆر لەخواترسانەوە.

"کێ...؟ چ بەندییەک...؟ ئەها، بەڵێ! هاوژینی داماوم! زۆر باشە، بارودۆخی چۆنە؟ جارز نەبووە؟ ئەزانیت... شتێک هەیە ئەمویست لێتان بپرسم... پێم وا بێت ئێستا ئەتوانم داوای جیابوونەوەی لێ بکەم؟

بە بیستنی ئەم قسەیە بە جۆرێک نارەحەت بووم، کە خەریک بوو کوپە قاوەکەم لە دەست بەر بێتەوە و هەموو قاوەکەی ناوی برژێت. گوڕاندم:

"جیابوونەوە!"

داخلەدڵانە لەگەڵ خۆما کەوتمە بیرکردنەوە و بە خۆمم وت: هەبێت و نەبێت، ئەو کابرا ڕەشتاڵەیەیە، کە سمێڵێکی کورتی دانابوو، شتێکیشی لە هونەری تەلارسازی دەزانی، زۆر جار لە دوورەوە دەهات بۆ بینینیان و زۆریش کارامە بوو لە سەرنجڕاکێشانی ئیلینا ئیڤانۆڤنا بەلای خۆیدا. ئەبێت دانی پێدا بنێم، کە بەڕاستی ڕقم لێی دەبۆوە، جێگەی چەندوچوونیش نەبوو کە دوێنێ ئیلینا ئیڤانۆڤنا لە ئاهەنگی دەموچاوداپۆشینەکە چاوی پێ کەوتووە یان دەشێت هاتبێت بۆ ئێرە و مێشکی ئیلینای بە قسەی پڕوپووچ پڕ کردبێت.

ئیلینا ئیڤانۆڤنا - وەک مرۆڤێک چۆن پێشتر ڕاهێنانی

لەسەر وانەیەک کردبێت، جووڵەیەکی خێرای کرد و وتی:

ئەگەر ئەو بڕیاری ئەوەی دابێت کە لەناو سکی ئەو تیمساحەدا بمێنێتەوە، ڕەنگە بە هەموو تەمەنی نەگەڕێتەوە، ئەبێت من لێرە قاچلەسەرقاچ لێی دانیشم و چاوەڕێی بکەم؟ مێردی ڕاستەقینە پێویستە لە ماڵی خۆیدا بژی، نەک لەناو سکی تیمساحدا!"

بە حەسرەتەوە لێم ڕوانی و وتم:

"بەڵام ئەمە پێشهاتێکی پێشبینینەکراو بوو."

لەپڕ ئاوەزی خۆی لەدەست دا و قیژاندی بەسەرما:

"ئاه. قسەم لەگەڵ مەکە، نامەوێت گوێ بگرم، تۆ هەمیشە لە دژی منیت، تۆ زۆر بەدبەختیت! چیتر پەیوەندیی بە تۆوە نییە. چیتر مافی ئەوەت نییە ئامۆژگاری من بکەیت! هەمووان دەڵێن کە ئەتوانم داوای جیابوونەوە بکەم، چونکە ئیڤان ماتڤیتیچ چیتر ناتوانێت مووچەکەی وەربگرێت!"

بە دەنگێکی کەساسانە و تژی لە بەزەیی وتم:

"ئێلینا ئیڤانۆڤنا! ئایا بەڕاست ئەوە تۆیت ئەم قسانە دەکەیت؟ چ ناپیاوێک ئەم بیرۆکەیەی کردۆتە مێشکتەوە؟ جیابوونەوە تەنها لەبەر مووچەبڕان؟ مەگەر دەکرێت لەبەر شتێکی ئاوا بێنرخ داوای جیابوونەوە بکرێت؟ ئیڤان ماتڤیتیچی داماویش، ئیڤان ماتڤیتیچی خێرلەخۆنەدیویش،

تەنانەت لەناو سکی تیمساحەکەشدا، خەریکە لە گڕی خۆشەویستیی تۆدا دەسووتێت. وەک کلۆشەکرێک، چۆن لەناو ئاودا دەتووێتەوە، ئاوا لە خۆشەویستیی تۆ لەناو سکی ئەو دەعبایەدا وەختە بتووێتەوە. دوێنێ کە تۆ لە ئاهەنگی دەموچاوداپۆشینەکەدا خەریکی ڕابواردن بوویت، ئیڤان ماتڤیتیچ دەیوت کە ڕەنگە لە کۆتا قۆناغدا داوا لە تۆ بکات، وەک خێزانێکی یاسایی خۆی بانگهێشتت بکات بۆ ناو سکی تیمساحەکە و بۆ ئەوەی لەوێدا لەگەڵی بژیت، بەتایبەت کە وا دەر دەکەوێت جێگەی بەتاڵ زۆر بێت لەناو سکی تیمساحەکەدا، ئەمەش نەک هەر بۆ دوو نەفەر، بگرە تەنانەت جێگەی سێ کەسیش دەبێتەوە...“

پاشان هەرچی بەشە سەرنجڕاکێشەکانی گفتوگۆکەی شەوی پێشووتری خۆم و ئیڤان ماتڤیتیچ بوو، بەوردی بۆم گێڕایەوە.

بە سەرسووڕمانێکەوە هاواری لێ بەرز بۆوە و وتی:

”چی، وتت چی! داوام لێ دەکەیت بە هەمان شێوە منیش بچمە ناو سکی ئەو تیمساحە بەدفەڕەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئیڤان ماتڤیتیچدا بم؟ چ بیرۆکەیەکە! مەگەر دەکرێت بە کڵاو و تەنوورە پەڕپەڕەکەمەوە بچمە ناو سکی تیمساحەکەوە؟ خوایە گیان، چ گەمژەیییەکە! کاتێک ئەچمە ناو لاشەی تیمساحەکەوە، ئەبێت چ دیمەنێکم

هەبێت، چەند ناخۆشە ئەگەر لەو کاتەدا یەکێک لەوێ بمبینێت! چەند ترسناکە! ئەی باشە لەوێ چی بخۆم؟ و... و... وە... پێویستە چی بکەم لەوێ کاتێک...؟ ئەی خوایە، خەڵک دوایی چۆن بیر دەکەنەوە... ئەی پێم ناڵێیت بە چ شتێکەوە خۆم سەرقاڵ بکەم لەناو سکی ئەو دەعبایەدا...؟ وتت بۆنی لاستیکی گوتا پرکای لێ دێت؟ ئەی ئەگەر بوو بە دەمەقاڵێمان چی بکەم؟ ئایا هەر دەبێت لەتەنیشت یەکەوە بمێنینەوە؟ پەکوو، چەند ترسناکە...!

خۆم فڕێ دایە ناو قسەکانییەوە، بە هەمان ئەو جۆشوخرۆشە سروشتییەی لە ناخی هەر مرۆڤێکدا دروست دەبێت، کاتێک هەست دەکات ڕاستییەکە بەلای خۆیدا پارسەنگە، وتم:

"قسەکانتم پەسەندە. هەموو ئەو بیانووانەی بۆ قسەکانت هێناتنەوە، پەسەندمە. ئیلینا ئیڤانۆڤنای خۆشەویست. بەڵام شتێکت لەیاد کردووە، پەیت بەوە نەبردووە، کە ئەو ناتوانێت بێ تۆ بژی. ئەگەر ئەو بانگهێشتت دەکات بۆ ئەوێ؛ ئەمەش سەلماندنی خۆشەویستییە، بەسۆزییە، وەفادارییە، پەرستنە... ئیلینا ئیڤانۆڤنای خۆشەویست! تۆ زۆر بە کەمی بیرت لەوە کردۆتەوە، کە ئەو چەندێک خۆشی دەوێیت!"

ئیلینا ئیڤانۆڤنا لە کاتێکدا دەستە بچووکە جوانەکانی

ڕادەوەشاند بۆ من، لەگەڵ پەنجە ناسکەکانی، کە دیار بوو تازە نینۆکەکانی شۆردبوو و بۆیەی کردبوون، وتی:

"نامەوێت، نامەوێت، نامەوێت هیچی دی لەم بارەیەوە ببیستم! ئەی پیاوی ناشرین! تۆ فرمێسکم پێ دەڕێژیت! ئەگەر پێت وایە ئەمە بیرۆکەیەکی باشە، کەواتە خۆت بچۆرە ناو سکی تیمساحەکەوە. تۆ هاوڕێی ئەویت. برۆرە ناو سکی تیمساحەکە و لەگەڵیا بە و تەواوی ژیانت سەبارەت بە زانستێکی بێزارکەر گفتوگۆ بکە لەگەڵیا..."

بە دەنگێکی نەرمونیان بەم ژنە هەڵەشەیەم وت:

"هەڵە دەکەیت ئەگەر بەم پێشنیارە پێبکەنیت. ئیڤان ماتڤیتیچ بە هەمان شێوە منی لەبەر دۆستی و جوامێرییەکەم و تۆی لەبەر ئەرکەکەت، بانگهێشتی ڕۆشتن - بۆ - ناو - سکی- تیمساحەکە کردووە. دوێنێ شەوی ڕابردوو، کاتێک ئیڤان ماتڤیتیچ باسی کشانی لاشەی تیمساحەکەی دەکرد و دەیوت ئەکشێت، ئەیویست زۆر بەسادەیی بڵێت، کە نەک تەنها بۆ دوو کەس، بەڵکوو بۆ منیش وەک هاوڕێیەکی خێزانەکە، جێگە هەیە. بەتایبەت ئەگەر من لەگەڵ تۆ یەک بگرم و ئیتر ئا بەم شێوەیە..."

ئێلینا ئیڤانۆڤنا، کە بە سەرسوورمانەوە لە منی دەڕوانی، هاواری کرد:

"چۆن چۆنی هەرسێکمان؟ چۆن هەرسێکمان لەناو

سکی ئەو تیمساحەدا جێگەمان دەبێتەوە؟ ئایا هەرسێکمان بەیەکەوە لەوێ دەبین؟ ها – ها - ها! بەڕاستی دووانی گەمژەن! ها – ها - ها! با پێشەکی پێت بڵێم، ئەگەر بچینە ئەوێ، ئەوە بەردەوام نقورچکت لێ دەگرم و هەراسانت دەکەم، ئەی بەدبەخت! ها – ها - ها!

پاشان چووە سەر چەرپاکەی و پاڵی دایەوە، هێندە پێکەنی، تا فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە. فرمێسکەکانی و پێکەنینەکەی هێندە دڵڕفێن بوو، کە وای لێ کردم چیتر نەتوانم بەسەر خۆمدا زاڵ بم و شەیدایانە ماچێکی دەستیم کرد، هەڵبەت ئەویش هیچ بەرهەڵستییەکی لە بەرامبەر ئەم کارەی من نەنواند و بگرە نەک بەرهەڵستیشی نەکرد بەڵکوو وا دیار بوو چێژیشی لێ بینیبێت، چونکە بەهێواشی نقورچکێکی لە گوێچکەکانم گرت، کە ئەمەش هێمای قایلبوون بوو بەو کارە.

پاشان هەردووکمان ئاسوودە و خۆشنوود بووین و کەیفمان زۆر بە یەکتر هات. مووبەموو، تەواوی پلانەکەی ئیڤان ماتڤیتیچم بۆ ڕوون کردەوە. بابەتی چۆنێتی میواندارییەکانی ئێوارانی لە دیوەخانی ماڵەکەی خۆی، ئیلینا ئیڤانۆڤنای بێئەندازە خۆشنوود کرد و وتی:

"تەنها پێویستم بە جلوبەرگێکی نوێ و زیاتر هەیە و پێویستە ئیڤان ماتڤیتیچ هەرچی زووترە، پارەی پێویستم

بۆ کڕینیان بۆ بنێرێت، تا زووتر بینێرێت، باشتر..."

پاشان وەک ئەوەی شتێکی بیر کەوتبێتەوە، وتی:

"تەنها... تەنها نازانم چۆن ئەتوانن ئەو بە حەوزێکەوە بۆ ئێرە بهێنن؟ کارێکی زۆر قێزەونە. من نامەوێت مێردەکەم لەناو حەوزێکدا هەڵبگیرێت و بهێنرێت بۆ ئێرە. چونکە ئەم دیمەنە وام لێ دەکات بەتەواوی هەست بە شەرمەزاری بکەم لە بەرچاوی سەردانکەرەکانمدا، کاتێک ئەم دیمەنە دەبینن... ئەمەم ناوێت، نا ئەمەم ناوێت!"

لەپڕ بیرم کەوتەوە و وتم:

"ئەرێ بەڕاست، دوێنێ تیمۆفی سمیۆنیچ هات بۆ ئێرە؟"

"ئاه بەڵێ، هاتبوو تا دڵنەواییم بکات، ئەزانی، تەواوی ئەو کاتەی لێرە بوو، بەیەکەوە یاری کاغەزمان کرد. ئەو لەسەر ئەوە یاریی لەگەڵدا کردم، کە ئەگەر هات و من بردمەوە، ئەوە ئەو هەندێک شیرینیم پێشکەش دەکات، ئەگەر هات و خۆشی بردییەوە، ئەوە دەستەکانم ماچ دەکات. چ مرۆیەکی بەدبەختە! تەنانەت ئامادە بوو لەگەڵم بێت بۆ ئاهەنگی دەموچاوداپۆشینەکە. بەڕاستی مرۆیەکی بەدبەختە!"

بە سەرنجێکەوە وتم:

"ناشێت ئالۆشی تێ کەوتبێت و لەبەر ئەوە هاتبێت!

هەرچەندە ناتوانم لۆمەی بکەم، چونکە کێ جوانیکی وەک تۆ خانەدان و دڵرفێن ببینێت، ئاڵۆشی تێ ناکەوێت؟"

"ئاهـ واز لەم پیاهەڵدانانەت بهێنە! بمێنەرەوە، چونکە ئەمەوێت نقورچکێکت وەک دیاری لێ بگرم. لەم دواییانەدا زۆر بەخراپی فێری نقورچکگرتن بووم. زۆر باشە، باسی چیت دەکرد؟ بە هەرحاڵ، بەڕاست وتت کە ئیڤان ماتڤیتیچ دوێنێ زیاد لە چەند جارێک باسی منی کردووە؟"

"نە... نەخێر، بەتەواوی نا... ئەبێت بڵێم ئەو زیاتر بیری لە چارەنووسی مرۆڤایەتی دەکردەوە، هەروەها دەیویست..."

ئاهـ... وازی لێ بێنە، با هەر بۆخۆی خەیاڵپلاوی بکات! پێویست ناکات تەواوی بکەیت! دڵنیام ئێستا تەواو جاڕز بووە. سبەینێ ئەچم بۆ سەردانی. بەدڵنیاییەوە، سبەینێ سەری لێ دەدەم. بەڵام ئەمڕۆ ناچم، چونکە سەرم ژان دەکات، بەتایبەت ئەمڕۆ، کە حەشامەتێکی زۆر بۆ بینینی ئەو دەچن و... ئەگەر لەوێ من ببینن، ئیتر هەمووی دەڵێت ئەم ژنە خێزانی ئەوە. منیش هەست بە شەرمەزاربوون دەکەم... بە خوات ئەسپێرم. تۆ ئەم ئێوارەیە لەوێ دەبیت، وا نییە؟"

"بەڵێ. ئەچم بۆ لای، چونکە داوای لێ کردم ڕۆژنامەکانی بۆ ببەم."

"بیرۆکەیەکی زۆر باشە. بڕۆ و بیانخوێنەرەوە بۆی. بەڵام ئەمڕۆ بۆ سەردانی من مەیە. چونکە تەندروستیم باش نییە و ڕەنگە بۆ سەردانی یەکێک بچم، تا چاوم پێی بکەوێت. خوات لەگەڵ، ساختەچی."

بیرم لەوە دەکردەوە، کە ئایا تۆ بڵێیت ئەم ئێوارەیە ئەو خانەدانە ڕەشتاڵەیە بێت بۆ سەردانی؟

لەسەر شوێنی کارەکەم، بە شێوەیەک هەڵسوکەوتم کرد، کە سەرنجی کەس بەلای خۆما ڕانەکێشم. کە وا هەست بکەن نیگەرانی شتێکم، بۆیە زۆر ئاسایی خۆم نیشان دا. بەڵام هەر زوو سەرنجم دا، کە هەندێک لە ڕۆژنامەکانی پێشکەوتن، لەنێوان هاوکارەکانمدا دەستاودەستی پێ دەکرێت و بە ڕووخسارێکی زۆر جەسوورانەوە خەریکی خوێندنەوەین. یەکەم ڕۆژنامە کە بەدەستم گەیشت، ڕۆژنامەی (نیوز-شیت) بوو، ڕۆژنامەیەک بوو، کە پەیوەست نەبوو بە کۆمەڵەیەکی تایبەتییەوە، بە شێوەیەکی گشتی هەواڵی مرۆڤدۆستانەی لەخۆ دەگرت. هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو، کە گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو لەلامان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر دەشمانخوێندەوە. ڕۆژنامەکەم وەرگرت و بێ ئەوەی سەرسووڕمانێک بە خۆمەوە نیشان بدەم، دەستم کرد بە خوێندنەوەی وتارەکەی ناوی:

((دوێنێ، پڕوپاگەندەیەکی نامۆ لە شەقامە بەشکۆ و تەلارە بەشکۆکانی پایتەختە مەزنەکەمان بڵاو بۆتەوە، پڕوپاگەندەکان دەڵێن، کە کەسێکی زۆر ناسراو و پەیوەست بە ژیانەوە و لە چینێکی بەرزی کۆمەڵایەتی، کە پێ دەچێت لە خواردنەکانی ڕیستورانت بۆریل و یانەی ئێکس ماندوو بووبێت، هەر لەبەر ئەم هۆکارە ڕوو دەکاتە گەلەرییەک، بۆ شوێنێک، کە بۆ یەکەم جارە تیمساحێکیان بۆ هێناوە، کە ماوەیەک بەر لە ئێستا هێنراوە بۆ پایتەختەکەمان، بە مەبەستی نمایشکردنی. ئەم پیاوە بەڕێزە بە پێداگرییەوە داوای ئەوەی کردووە، کە ئەو تیمساحەی بۆ نانی ئێوارە بۆ ئامادە بکەن. پاش ڕێکەوتن لەگەڵ خاوەنی تیمساحەکە، بۆ قووتدانی ئەو دەستبەکار دەبێت "(مەبەستمان قووتدانی خاوەنی تیمساحەکە نییە، کە ئەڵمانییەکی بەڕێز و بەنەزاکەتە، بەڵکوو مەبەست لە تیمساحەکەیەتی نەک خۆی)." پاش ئەوەی تیمساحەکەی دەهێنرێتە بەردەست، بە چەقۆ بچووکە گیرفانییەکەی دەست دەکات بە لێکردنەوەی پارچەی چەور و ئاوداری جەستەی تیمساحە زیندووەکە و بە خێراییەکی نائاسایی پەلاماری تیمساحەکە دەدات و قووتی دەدات، بە شێوەیەک، کە تەواوی جەستەی ئەو تیمساحە لە گەدە گەورەکەی خۆیدا جێ دەکاتەوە. تەنانەت هەر بە خواردنی تیمساحەکەشەوە ناوەستێت،

بەڵکوو دەیەوێت هێرش بکاتە سەر نەمسە میسرییەکەش – کە هاوڕێی هەمیشەییی تیمساحەکە بوو. ڕەنگە وا بیری کردبێتەوە، کە ئەمەش بۆ دوای خواردنەکە زۆر بەچێژ بێت! ئێمە لەگەڵ ئەم ژەمەخۆراکە نوێیە، کە ورگپەرستانی بیانی هەر لە کۆنەوە سەروکاریان لەگەڵ ئەم شتانەدا هەبووە، هیچ لارییەکمان نییە. لە ڕاستیدا ئێمە پێشبینی وەها ڕۆژێکمان دەکرد، کە ئەم شتانە بە چاوەکانی خۆمان ببینین. لە ڕابردووشدا لۆردەکانی وڵاتی ئینگلاند و گەشتیارەکان، میوانداری گەورەیان ڕێک دەخست، ئەو خواردنەشی کە لەم میوانداریی گەورانەدا ئامادە دەکرا، لە گۆشتی ئەو تیمساحانە ئامادە دەکرا، کە لە میسردا ڕاو دەکران. پشتی ئەم دەعبایە، کە لە گۆشتی گوێرەکە دەچێت، دەکولێندرا لەگەڵ بەهاراتی خەرتەلە و پیاز و پەتاتە و بەم شێوەیە نۆشیان دەکرد.

فەڕەنسییەکانیش بە هەمان شێوە کاتی خۆی کە هاتن بۆ میسر، هاوڕێ لەگەڵ "(فێردیناند دی لیسبس)،" ئەوان مەیلیان لە پەنجە کولاوەکانی تیمساحەکە بوو لەناو لمی گەرمدا، وەک لە پشتی تیمساحەکە، ئەمەش هەر بۆ ئەوەی بە پێچەوانەی ئینگلیزەکانەوە بن، چونکە ئینگلیزەکان هەمیشە پێیان پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکردن.

ئێمە هەردوو ڕێگەکەمان بەلاوە پەسەندە و هیچ

کێشەیەکیشمان نییە لەسەری، بگرە هەردوو ڕێگەکە جێگەی ستایشکردنیشن. ئێمە وەک خۆمان، دڵخۆشین بەوەی کە لقێکی نوێ لە پیشەسازی دەر کەوتووە لە وڵاتەکەمانا، چونکە وڵاتە گەورە و هەمەجۆرەکەمان پێویستی بەم جۆرە پیشەسازییانەیە. ڕەنگە کەمتر لە ماوەی یەک ساڵ، سەدان تیمساح هاوردەی ڕووسیا بکرێت بۆ جێگرتنەوەی ئەو یەکەم تیمساحەی لە گەدەی ئەو پیاوە چلێسەی پترسبۆرگ ون بوو. لە ڕاستیدا، بۆ ناکرێت هەوڵی ئەوە بدرێت، کە تیمساحەکان لەگەڵ ئاووهەوای ڕووسیا ڕابهێنرێن؟ ئەگەر ئاوی ڕووباری نیڤا بۆ ئەم گیاندارە نامۆیە سازگار نییە و زۆر ساردە، ئەوە چاڵاو لە پایتەخت ڕووبار و دەریاچەی زۆر لە دەرەوەی پایتەخت هەیە. بۆ نموونە، بۆچی بۆ پەروەردەکردنی تیمساح لە چاڵاوەکانی پارگۆلۆڤۆ خەرجی بۆ دابین نەکرێت؟ یاخود لە پاڤلۆڤسک، یان لەو چاڵاوانەی لە پریسنینسکی و هەروەها لە سامۆتکا لە مۆسکۆ؟ ئەگەر بێت و ڕەزامەندیی ئەم کارە وەربگیرێت و بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەم ڕێگەیە خۆراکێکی بەتاموچێژ بۆ خۆشخۆرەکانمان، ئەوانەی هەمیشە ناڕازین، دابین دەبێت و ئەو کێشەیەشیان لە کۆڵ دەبێتەوە، لە هەمانکاتیشا، وەک سەرگەرمییەکی چێژبەخشیش دەبێت بۆ ئەو خانمانەی کە بەردەوام لەلای ئەو چاڵاوانە پیاسە

دەکەن، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، بۆ فێرکردنی منداڵان لە مێژووی سروشتدا سوودی لێ دەبینرێت. پێستی تیمساح دەتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت بۆ دروستکردنی کیفی خشڵ و گەوهەر، کیفی ئاسایی، قووتووی جگەرە، هەروەها بۆ دروستکردنی تورەکە، کە دەتوانرێت کتێبی تێدا هەڵبگیرێت. بە هەزاران ڕۆبڵ، بە هەزاران لەو دراوە کاغەزییە پۆخڵە، کە بازرگانەکانمان خۆشەویستییەکی لەڕادەبەدەریان بۆی هەیە، بێتە سەر دراوەکانی تریان و پاشەکەوتیکی باشی لێ بکەن، ڕەنگە ئەم سەرمایە لەبننەهاتووە لە پێستی ئەو تیمساحەدا خۆی حەشار دابێت. ئێمە هیواداریــن جارێکی تریش سەبارەت بەم بابەتە سەرنجڕاکێشە گفتوگۆ بکەینەوە)

لەگەڵ ئەوەی پێشبینیی وەها وتارێکم دەکرد، بەڵام ناڕاستی و بێباکی نووسەرەکەی بەتەواوی جاڕزی کردم. لەبەر ئەوەی کەسێکم نەدۆزییەوە، تا ئەو کاریگەرییە گیانییەی بۆم دروست بوو، ئەو هەستە ناخۆشەی بۆم دروست ببوو، لەگەڵیدا بەش بکەم، ناچار ڕووم کردە پرۆهۆر ساڤیچ - کە بەرامبەرم دانیشتبوو.

سەرنجم دا، کە ماوەیەک دەبێت چاوی لەسەر نەتروکاندووم و ڕۆژنامەی (ڤۆیس)ی بە دەستەوەیە و وەک ئەوەی بیەوێت بیدات بە من. بێ ئەوەی وشەیەکی

لە زار بێتە دەر، ڕۆژنامەی (نیوز-شیت)ەکەی لێ سەندم، لە کاتێکدا ڕۆژنامەی (ڤۆیس)ی بە من دەدا، پەنجەی خۆی خستە سەر ناونیشانی وتارێک، تا بیخوێنمەوە.

ئەم پرۆهۆر ساڤیچە پیاوێکی تا بڵێی سەیر و نامۆ بوو. پیرەپیاوێکی زگوردی بوو، بەڵام بێدەنگ و کەمدوو. لەگەڵ هیچ یەکێک لە ئێمە، پەیوەندییەکی دۆستانەی نەبوو، بەدەگمەن لە سەرکار قسەی لەگەڵ یەکێکدا دەکرد. بیروباوەڕی تایبەت بە خۆی هەبوو لەسەر هەموو شتێک. بەڵام خۆی لە ئاشکراکردنی بیروباوەڕەکانی دەپاراست. ئەو بەتەنها دەژیا. زۆر بەکەمی هاوکارەکانی سەردانیان دەکرد.

ئەوەی لە ڕۆژنامەی (ڤۆیس) خوێندمەوە، بەم شێوەیە بوو:

( ئاشکرایە لای هەمووان، کە ئێمە پێشکەوتنخواز و مرۆڤدۆستین و هەر بۆیە لەم ڕووەوە خۆمان لە ئاستی تەواوی ئەوروپادا بە یەکسان دەزانین و خۆمان لە ئاستی ئەواندا ئەبینینەوە. بەڵام، سەرباری هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکانی ڕۆژنامەکەمان لەم ڕووەوە، هێشتا نەگەیشتووینەتە پلەی کامڵبوون لە بیرکردنەوەدا. هەر ئەوەی کە دوێنێ ڕووداوێکی هەژێنەر لە گەلەرییەک ڕووی دا، دەکرێت بە کامڵنەبوونی بیرکردنەوەی ئێمە

لە قەڵەم بدرێت، ئێمەش زۆر لەمەوبەر پێشبینیی ئەم دۆخەمان دەکرد.

کابرایەکی بیانی دێتە ناو پایتەختەکەمان، هاوڕێ لەگەڵ خۆیدا تیمساحێک دێنێت و لە گەلەرییەکدا نمایشی دەکات. ئێمە ڕاستەوخۆ و بەخێرایی پێشوازیمان لەم لقە نوێیە بەسوودەی پیشەسازی کرد، چونکە وڵاتە بەهێز و ڕەنگینەکەمان پێویستییەکی زۆری بەم جۆرە پیشەسازییانە هەیە. دوێنێ لەناکاو و دەوروبەری کاتژمێر چواری پاشنیوەڕۆ، خانەدانێکی جوانخاس و دلێر، لە کاتێکا لەوپەڕی مەستیدا دەبێت، خۆی دەکات بە دوکانی کابرای بیانیدا. پاش ئەوەی پارەی چوونەژوورەوەی خۆی دەدات و ڕاستەوخۆ و بێئاگایانە غار دەدات و خۆی فڕێ ئەداتە ناو دەمی تیمساحەکە، گیانداری داماویش ئەشڵەژێت و لەپێناو مانەوەی خۆی و ڕێگرتن لەوەی بخنکێت، ناچار ئەم خانەدانە هەڵدەلووشێت. کابرای نامۆ، پاش خۆهەڵدانە ناو دەمی تیمساحەکە، بێ سێ و دوو لە خەوێکی قووڵ ڕۆدەچێت و نە هاواری خاوەن تیمساح و نە گریانوزاریی خێزانە تۆقیوەکەی و نە هەڕەشەی چوون - بە - شوێن - پۆلیسدا، هیچ یەکێک لەم شتانە بەقەد دەنکە خەردەلێک کاری تێ نەکرد. لەناو سکی تیمساحەکەوە، جگە لە دەنگی قاقالێدان و هەڕەشەکردن بە کەولکردن و پێست - لەبەر - داماڵینی تیمساحەی داماو، گوێبیستی هیچ

شتێکی تر نەبووین. هەرچەندە ئەو گیاندارە داماوە ناچار بوو پەیکەرێکی ئاوا زەلاح قووت بدات. بەڵام فرمێسکی بێهوودەی دەڕشت. میوانی بانگهێشتنەکراو، لە تەتەری تووڕەوتڕۆ خراپترە. هەر وەک ئەو پەندەی دەڵێت: "(ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە)."

ئێمە نازانین ئەم ڕووداوە بەربەریە - کە کەمی ئاستی ژیاریمان دەسەلمێنێت و ئابڕووی ئێمە لە بەرچاو بێگانەکان دەتکێنێت - بە چ شێوەیەک شیکاری بکەین! هەوەسێکی سەرشێتانەی لەم جۆرە، بریتییە لە گیانی بێباکانەی مرۆڤی ڕووسی. بەم شێوەیە، دەرچەیەکی دەربازبوونی نوێ بەدەست هاتووە.

دەکرێت بپرسین: ئایا ئامانجی ئەم میوانە بانگهێشتنەکراوە چی بووە؟ ئایا وێڵ بوو بەشوێن جێگەیەکی گەرم و نەرمەوە؟ بەڵام خانووگەلێکی زۆر نایاب لە پایتەخت بە نرخێکی هەرزان و کەلوپەلی گونجاوەوە دەست دەکەوێت، کە ئاوەکەی لە ڕووباری نیڤا بۆ دابین کراوە و پێپلیکانەکانی بە گاز ڕووناک کراوەتەوە و هەروەها حەسحەسی تایبەتیشی لەلایەن خاوەن خانووەکەوە بۆ دابین کراوە. ئێمە دەمانەوێت سەرنجی خوێنەرەکانمان بەلای ئەو کردە شەڕەنگێزانەیەدا ڕابکێشین، کە بەرامبەر بەو تیمساحە داماوە کراوە.

گومانی تێدا نییە، کە کارێکی هێندە ئاسان نییە بۆ ئەو تیمساحە، کە پەیکەرێکی زەلامی لەو شێوەیە هەرس بکات، هەر بۆیە و لەم ڕووەوە، گیانداری داماو ئێستا بە ئەندازەی کێوێک هەڵئاوساوە و بە ئازارێکی زۆرەوە چاوەڕوانی مەرگە. لە ئەوروپا، هەرکەسێک کارێکی نامرۆڤانە لەگەڵ ئاژەڵێکی ماڵیدا بکات، ئەوە ڕووبەڕووی لێپێچینەوەی یاسایی دەبێتەوە. بەڵام ئێمە سەرباری ڕۆشنبیرییە ئەوروپییەکەمان، سەرباری شۆستە و ڕاڕەوە ئەوروپییەکەمان، سەرباری هونەری تەلارسازیی خانووە ئەوروپییەکانمان، کەچی هێشتاش ئامادە نین واز لە نەریتە سواوەکانمان بهێنین، بگرە تا ئەم ساتەش، بە چاوێکی پیرۆزەوە لەو نەریتانەمان دەڕوانین.

"(هەرچەندە خانووەکانمان نوێن، بەڵام نەریتەکانمان سواون)"

هەرچەندە لە ڕاستیشدا خانووەکانی ئێمە هێندەش نوێ نین، چونکە هەر هیچیشیان نەبێت، ئەوە بەدڵنیایییەوە پێپلیکانەکانی داڕزاون. ئێمە چەندین جار لەناو ڕۆژنامەکەی خۆماندا ئاماژەمان بەم ڕاستییە کردووە، کە لەلایەک لەلاکانی پترسبۆرگ لە ماڵەکەی لوکیانۆڤی بازرگان، پێپلیکانە لە - تەختە - دروستکراوەکەی ماڵەکەی داڕزیوە و هاکا داڕما، ئەوەی جێگەی مەترسییە

لەمەدا، ئەوەیە کە ماوەیەکی زۆرە ئەم مەترسییە لەسەر ئافیمیا سکاپیدارۆڤی خزمەتکارە لەو ماڵەدا، ئەو خاتوونەی مێردەکەی ئەفسەرە. ئەو گلەییی لەوە هەیە، کە ناوێرێت بە دەفرێ پڕ لە ئاوەوە بەو پێپلیکانەیەدا سەر بکەوێت. لە کۆتاییدا، پێشگۆییەکانی ئێمە ڕاست دەر چوون، چونکە دوێنێ شەوی ڕابردوو، کاتژمێر هەشت و نیو، ئافیما سکاپیدارۆڤ بە قازانێکی پڕ لە شۆرباوە، لە پێپلیکانەکانەوە دەکەوێتە خوارەوە و هەر لە جێدا قاچێکی دەشکێت. لە ڕاستیدا، ئێمە نازانین کە ئایا لوکیانۆڤ ئامادەیە دوای ڕوودانی ئەم ڕووداوە لە ماڵەکەی، ئەو پێپلیکانانە چاک بکاتەوە یان نا، چونکە ئێمەی ڕووسی، نەریتمان وایە تا کار لە کار نەترازێت، هیچ هەنگاوێک نانێین.

لە پێشهاتی ئەوەی کە چی ڕووی دا بۆ خزمەتکارەکە، خوێنەری هێژا لەوە ئاگادار دەکەینەوە، کە ئەو خاتوونەی بووە قوربانیی بێباکی کابرایەکی ڕووسی، ئێستا گواستراوەتەوە بۆ نەخۆشخانە و لەژێر چاودێریی پزیشکدایە. ئێمەی ڕووسی، هەرگیز دەست لەم خوو و نەریتە خراپانەی خۆمان هەڵناگرین و هەرگیز فێر نابین. بۆ نموونە، مەیخانەکانی سەر شەقامی ڤیبۆرگسکی، کاتێک قوڕ و لیتەی ناو دوکانەکانیان پاک دەکەنەوە، فێری ئەوە نابن نەیخەنە بەر پێی ڕێبوارانی سەر شۆستەکە؛ لە

کاتێکا ئەتوانرێت ئەو قوڕ و لیتەیە هەمووی لە شوێنێکا خڕ بکرێتەوە و سەرەڕێی کەسیش نەگرێت، هەر وەک چۆن لە ئەوروپا ئەمە دەکرێت... هتد.)

لە کاتێکا لە پرۆهۆر ساڤیچم ئەڕوانی، بە شڵەژاوییەوە لێم پرسی:

"ئەمە چییە؟ هەرچەند ئەیهێنم و ئەیبەم، سەر لەم وتارە دەر ناکەم، ئەمە چ مانایەکی هەیە؟"

"مەبەستت چییە؟"

"لە هیچ شتێک تێناگەم، لەبری ئەوەی بەزەییان بە بارودۆخی ئیڤان ماتڤیتیچدا بێتەوە، کەچی فرمێسکی تیمساحی بۆ تیمساحەکە هەڵدەڕێژن و بەزەییان بەودا دێتەوە!"

"جا بۆ بەزەییان پێیدا نەیەتەوە؟ ئەوانە تەنانەت بەزەییان بە دڕندەترین گیاندار و شیردەرێکیشدا دێتەوە. ئێمەش دەبێت وەک ئەوروپا بیر بکەینەوە بۆ ئەوەی بگەینەوە بە ئەوان. ئایا نابێت؟ بە هەمان شێوە، لێرەش هەستێکی پڕ لە جۆشوخرۆش هەیە بەرامبەر بە تیمساح، ها، ها، ها!"

پرۆهۆر ساڤیچی پیر و نامۆ، پاش دەربڕینی ئەم چەند ڕستەیە، سەری کردەوە بەناو کاغەزەکانیا و چیتر وشەیەکی دی دەر نەبڕی.

ڕۆژنامەکانی (ڤۆیس) و (نیوز-شیت)م قەد کرد و کردمنە ناو گیرفانمەوە و هەر ڕۆژنامەیەکی تریش کە بەردەستم کەوت، کۆم کردنەوە بۆ ئەوەی ئێوارە بیانبەم بۆ ئیڤان ماتڤیتیچ. لەگەڵ ئەوەی کاتێکی زۆری مابوو بۆ ئێوارە، زوو شوێنی کارەکەم بەجێ هێشت، بۆ ئەوەی بەرەو گەلەرییەکە بڕۆم و لە مەودایەکی تا ڕادەیەک دوورەوە ببینم، کە لەوێ چ باسە و گوێبیستی ئەو خەڵکە بم، بزانم ئەوان سەبارەت بەم ڕووداوە چۆن بیر دەکەنەوە.

پێشبینی ئەوەم دەکرد، کە قەرەباڵغییەکی پڕ لە هۆسە بێت. هەر لەبەر ئەمە، یەخەی پاڵتۆکەم هەڵکێشا بۆ سەرەوە، بۆ ئەوەی بتوانم ڕووبەڕووی ئەو قەرەباڵغییە ببمەوە، چونکە دانی پێدا دەنێم کە تۆزێک شەرمم دەکرد، لەبەر ئەوەی زۆر حەزم بە قەرەباڵغی و تێکەڵاوبوونی ناو خەڵک نەبوو. بەڵام هەست ئەکەم من مافی ئەوەم نییە باسی هەستێکی خاڵی و ئاسایی خۆم بکەم، لە کاتێکدا ڕووبەڕووی ڕووداوێکی نائاسایی و ڕاستەقینەی وەک ئەم ڕووداوە بوومەتەوە.

